گەشەپێدان










کەریم شازلی

# گەورە بژی

وەرگێڕانی : نێچیروان جاسم وەلی



اقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
شعبة ايداع الكتب



هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
بەشی سپاردنی کتێب

Kurdistan Regional - Iraq / Council of Ministers
Ministry of Culture & Youth - G.D. of Public Libraries

ژمارە: ٤٤٨ العدد:
رێکەوت: / ١٢ / ٢٠٢٠ کوردی التاريخ: ٢٢ / ١٠ / ٢٠٢٠

## بۆ/ چاپخانەی دەرەوەی هەرێم



## ب/ ژمارەی سپاردن

بەپێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣
ژمارەی سپاردن درا بەکتێبی (پەروەردەی ژیرانە)لەوەرگێرانی(هندرێن هەژار) بە تیراژی (١٠٠٠) دانە بە ناوەرۆکی ( پەروەردەیی) لە چاپخانەکەتان چاپ بکرێت بەمەرجێک (٥) دانە بۆبەشی سپاردن ڕەوانە بکەن

لەگەڵ ڕێزماندا....

| ژمارەی سپاردن | ١٣٥ |
| --- | --- |
| ساڵ | ٢٠٢٠ |

تێبینی:
١-نووسراوی سەرەوە، دەقەکەی لە پەڕەی دووەمی کتێبەکە وەکو خۆی دادەنرێت، بەشێوەی سکان.
٢-هەرچاپخانەیەک پابەند نەبێت بەناردنەوەی (٥)دانە لە کتێبەکە، جارێکی تر ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.

د. سەرباز جەوهەر محەمەد
ج/بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانە گشتییەکان
٢٢/ ١٠ /٢٠٢٠

لەبەرگ:
-کارگێری خزینەی
-هەڵگرتن
-خولاو

هەرێمی کوردستانی عێراق - هەولێر - شەقامی کوردستان - پشت وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
اقليم كوردستان العراق - أربيل - شارع كوردستان - خلف وزارة الثقافة و الشباب
library.kurdistan@yahoo.com
Iraq - KRG - Erbil - Behind MOCY

## پێشکەشکردن

بۆ ئەوانەی وا دەبینن شتێك نییە نەگۆڕدرێت..

بۆ ئەوانەی شەونخونییان دەکرد و بیر دەکەنەوە لەوەی چۆن دەکرێت ژیان دوای هاتنیان باشتر بێت لە پێش هاتنیان..

بۆ ئەوانەی جیاوازییان خولقاند.. و وازیان لە بەشی خۆیان دەهێنا، تا وشەی ڕاستی بالاّ بێت..

## گەڕانێك بە دوای گەورەییدا..

باری زەمانە پیاوانێك دێنێتە کایەوە خەڵکی ئاگادار دەکەنەوە،

شێواوی لا دەبەن، بە پێکەوەیی بیر دەکەنەوە،

بە ویستەوە کار دەکەن، شتەکان هەڵناوەشێننەوە تا ئەوەی مەبەستیان بێت بەدەستی دەهێنن؟!

عەبدولڕەحمان کەواکیبی

## ڕاسپاردە..

لە کۆنـدا یـەکێك لـە داناکـان گـوێی لـە پیاوێـك بـوو لـە تـاڵاوی پەشیمانیدا دەیگوت: ((بریا چاوم بە یەکێك دەکەوت پێم بڵێت)).

داناکە وەڵامی دایەوە و گوتی: خۆزگە بە خۆت کارت بەوە کـرد، کـە لەگەڵتدا بوو!، ئەمەش ڕاستییە.. لەگەڵ هەمووماندا ڕێنیشاندەرە.

جیاکاریی چاکە بەگوێرەی ئەوەیە وا لە خۆی بکـات ڕوون و ڕاستگۆ بێـت، بـە جۆرێـك پێویسـتی بـە بەڵگـەی سـەلماندنی خـودی یـا جەختکردنەوەی بەهاکەی، یا ڕوونکردنەوە لەسەری نەبێت!!

ئەمەش بە سروشـتی لـە بـەهای مـەعریفی کـەم ناکاتـەوە.. بـەڵکوو بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستی بەهای کار و کۆڵنەدان.

وا گومان مەبە تەنیا تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاستیدایت:

هەڵسە.. جێگەی خـۆت لـەنێو هـاوڕێ مەزنەکانتـدا بکـەوە، گومـانی خـراپ بـە سـەردەمەکەت مەبـە، وا دامـەنێ تـۆ ((بولبـولی لـەناو قەلەڕەشان))دا، یا تۆ ((ساڵحی لەنێو سەموود))دا!

ژیانی مرۆڤایەتی بە گەورە دانانرێت تەنیا بۆ ئەو قارەمانییەتییانە نەبێت، کە لە چاکەوە سەرچاوە دەگرن و بەپێی مەبەستەکانی کار دەکەن..

((جەنگیزخان)) نزم کرایەوە و ((بوزا)) بەرز کرایەوە..

ناوبانگی ((ناپلیۆن پۆناپارت)) پێچرایەوە و ناڤودەنگی ((پاستێر)) بڵاو بووەوە.

گۆچانەکەی ((هیلتەر)) شکێنرا و پەشتەماڵەکەی ((غاندی)) پیرۆز کرا.

مێژوو ناگەڕێتەوە لای ستەمکار و خاوەن دەسەڵات بوەستێت.. بەڵکوو لەگەڵ خاوەن جوامێری و ڕاستیدایە.

خالید محەمەد خالید

فرمێسکت بسڕەوە گریان و هاوار سوودت پێ ناگەیەنن

بە ویستەوە ڕێگە بگرە بەر و مەڵێ ڕێگە چۆن دەبێت

خاوەن هیوا ڕۆژێك هەوڵی دابێت و داناییەکەی ڕێبەریەتی

نەخێر هیچ کات مرۆڤ شکست ناهێنێت کە ئامانجەکەی شکۆدار بێت

ئیبراهیم توقان

## لە دەستپێکدا

**بارودۆخەکە بە نزیکەیی لە ناوەڕاستی نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو دەستی پێکرد**

کاتێك لە کتێبخانەکاندا ئەوەی پێی دەگوترێت کتێبەکانی پەرەپێدانی مرۆیی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش کەوتە بەرچاومان، دوای چەند ساڵێکی کەم ڕێکلامی خوول و سیمینارەکان دەستی پێکرد، کە باسی بەدەرخستنی دێوە شاراوەکەی ناخیان بۆ دەکردین و لە هەموو شوێنێك دەوریان دابووین.

لە ماوەی دە ساڵی کۆتاییدا* بینیمان چۆن ئەم بارودۆخە هاوشێوەی شتێکی وەکوو (مۆدێلی جلوبەرگ)ی لێ هاتووە و هەر یەکە لە ئێمە کاردانەوەی خۆی بە ((ئەرێنی یان نەرێنی)) بەرانبەر بەم بابەتە هەیە.

لەبەرئەوەی یەکێکم لە بایەخپێدەرانی زانستە مرۆییەکان و هەواداری هەموو شتێك، کە لە توانایدا هەبێت ژیانی مرۆڤ باشتر بکات. دیتمان لەو تاقگە لەبەرپۆیشتووەی کتێب و خوولەکانی پەرەپێدانی مرۆیی دیوێکی ئەرێنی و ڕوویەکی نەرێنی هەیە!

---

* مەبەست کاتی نووسینی کتێبەکەیە (و).

هەرچی دیوە ئەرێنییەکەیە ئەوا ئەم تێزە وای کرد خەڵکی گەنجان بە شێوەیەکی وردتر زیاتر سەرنجی ناوەڕۆکەکەی بدەن، هان دەدرێت بۆ ئاماژەدان بە کەموکوڕیی گیانی، جەخت دەکرێتەوە لەوەی گرفتی متمانەبەخۆبوونی هەیە، یا کێشەی لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیدا هەیە، یاخود دووچاری شڵەژانی دەروونی هاتووە لەنێوان بەهاکانی ڕابردوو و ئاڵنگارییەکانی ژیانی نوێدا، لە دواییدا خەڵکی تەماشای ناوەڕۆك دەکەن و تیرەکانیان بە شێوەیەکی تەواو و تێکڕایی ئامانجی کۆمەڵگە ناپێکن.

هزرەکە ئەوەیە هەر یەك لە ئێمە هەست بکات وەك پێویست نییە، پاشان وای دەبینێت لەبەردەم بەربەستەکەیدا ئەرکی گۆڕانکاریی ئەم کەموکوڕییە شتێکی گەورەیە، لە لایەکی تری گرنگەوە داوات لێ دەکات ئەویش ئەوەیە پەرەپێدانی خودی دەروونناسی لە خەڵکی نزیك کردووەتەوە و وای لێ کردوون خەڵکی بڕوایان پێی هەبێت، لە کاتێکدا مامۆستاکانی دەروونناسی و ڕاوێژکارانی دەروونی هیچ هەنگاوێکیان بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی دەروونذروستی لەنێو خەڵکیدا نەناوە، بەوە وازیان هێناوە لە پشتی مێزە ڕازاوەکانیاندا بن و چاوەڕێی ئەوە بن نەخۆشیان بۆ بهێنرێتە بەر دەرگەی نۆڕینگە.

وەك گەواهیدەرێکی باروذۆخەکە بزاوتی ((پەرەپێدانی مرۆیی)) ڕوویەکی گرنگی هەیە ناکرێت فەرامۆش بکرێت، بەداخەوە

ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆری نابابەتی بووەوە، ئەمە وای کرد هەنگاوەکانی پاشەکشە نەکات و پێگەکەی قایمتر کرد، بۆیە کەوتە هەڵەی زۆر و کارەساتئامێزەوە!

بۆیە پووچگەرایی دەبینین، کە گەنجەکان دەخوێننەوە و لە ئاوەزی بەشداربوو دەترسن، زۆرتر بایەخ بە بانگەشە دەدەن زیاتر لە بەهاکەی، گوتەی لەقوتوونراوی بێ لێکدانەوە دەکڕن. بارودۆخەکە پەرەی سەند گەیشتە قۆناغێکی مەترسیداری هاوشێوەی نەشتەرگەرییەکانی چاندن، بۆیە بینیمان ئەوەی لەبارەی شتێکەوە قسە بۆ کەسێك دەکات خۆی نیەتی و بەڵێنی خەونکەلی ناواقیعییان پێ دەدات، ناسناوێکی کردووەتە پێشناو خۆی بۆ خۆی داتاشیوە، ڕەنگە بانگەشەی بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆراش لێرە و لەوێدا بکات.

جگە لە هەموو ئەوانە مەترسیدارتر ڕەفتاری کۆرگێڕ و نووسەرانە لە دوو ڕێچکەوە:

**هەرچی یەکەمیانە لێپرسینەوەی ویستەکانی خەڵکە و ئاگادارکردنەوەیانە بە درێژاییی کات سەبارەت بە هەبوونی سەرکەوتنی شانازیپێکراو و سەرزەنشتکردنیان لەسەر ئەو بارودۆخەی تێیدان، بەبێ سەرنجدانی بابەتییانەی باری ئێستا و دانانی پلانی کاری ڕاستەقینە بۆ زاڵبوون بەسەریدا، کە وای کردووە**

بۆشایەکی گەورە لەنێوان تیۆر و واقیعدا دروست بێت. بەشداربوو دووچاری جۆرێك لە حاڵەتی زێدە داڕوخان یا نەگونجان دەبێت لەوەی پێشکەشی دەکرێت، جا بۆ نا، ڕاهێنەری شیکپۆش بە درێژایی کات دەیەوێت پێمان بڵێت بارودۆخەکە ئاسانە، ئەو بارودۆخەی هەیە ناتوانێت ببێتە کۆسپی ڕێگەمان، بێ ئەوەی نەخشە ڕێگەیەکی ڕاستەقینەمان پێ بدات، بە درێژایی کات پشت بە بابەتی تیۆری و ئامار و چیرۆکی نامۆ دەبەستێت. بەڵێ شانازی پێکراوە، بەڵام چارەسەرێکی ئامادەی پێ نییە بۆ ئەو بارەی تێیداین.

ڕێچکە مەترسیدارەکەی تر هەمیشە جەختکردنەوەیانە لەسەر ئەو هزرەی (ژمارە ۱) بیت و بەستنەوەی بە سەرکەوتن و ناوبانگەوە و فەرامۆشکردنی بەهای سەرکەوتنە بچووکە کەڵەکەبووەکان و هەموو کات ئاماژەدانیان بەوەی تۆ پاشکەوتووی و تاوەکوو وا بیت کەس گوێی لە سەرکەوتنت نابێت، چونکە تۆ وەك پێویست نیت!

جێگەی داخە بزواتی کۆمەڵی دەورووبەرمان بەم ئاڕاستە دەڕوات و ئەو تاقگە لەبەرڕۆیشتووەی بانگەشەی بازارگەری، کە لە هەموو لایەکەوە دەوری داوین هەمان چەمکمان لا دووپات دەکاتەوە ئێمە کەمتەرخەمین بەرانبەر بە خۆمان، چونکە خاوەنی ئۆتۆمبێلی گرانبەها و ڤیلای سەرنجڕاکێش نین و ناتوانین پشووی کۆتایی هەفتە لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانمان لێرە و لەوێدا بەسەر بەرین.

هەموو ئەمەی بە شێوەیەکی ناویستانە وای لێ کردووین ئەدجامی لەکیسدانی هەل و هەولدانی گەیشتنە بەو خەون و ئاواتانەی کۆمەڵ بۆی داڕشتووین، مەترسیدارتر ئەوەیە بووەتە هۆکارێکی ئاکاری لەم کۆششە ئاگرنگەدا، هەل لە یەکجار زیاتر نایەت وەک پێیان گوتووین، ناکرێت بە بیانووی ئەوەی ویژدان یان ئاکار ڕووبەڕوومان دەبێتەوە لە دەستی بدەین، داوامان لێ دەکەن هەل لە دەست بدەین.. بۆیە دەڵێین جێگەی داخە!

بەمجۆرە یان بەشێوەی تر پەرەپێدانی خودی داوای لێ کردووین بە درێژاییی کات لە ڕاکەڕاکدا بین، لە کاتی تەرکیزکردن بۆ هێنانە کایەی ئەو سەرکەوتنەی پێیان گوتووین سەرەڕای ئەوەی ئێمە پێوەی دەناڵێنین و ئێمە مامەڵە لەگەڵ بژاردەکاندا دەکەین، بڕیار وا نییە ئێمە لە خەو هەڵبسین ببینە فێڵباز، یاد بەدئاکار، بەڵکوو پەنا بۆ فێڵی ((بیانوو هێنانەوە)) دەبەین هەزار ناوی لێ دەنێین تا بتوانین ئەو بۆشاییەی لە نێوان ئاواتە گەورەکانمان و ویژدانە ماندووەکانمان هەیە پڕی بکەینەوە، خۆمان فریو دەدەین لە میانەی جەختکردنەوە لەسەرئەوەی دژبەرییەک لەگەڵ ویژدانماندا نابینین کارێکی نکۆڵی لێنەکراوە لەم سەردەمەماندا.. بەداخەوە ئێمە بە دوای سەرکەوتنێك دەگەڕێین بۆ خەڵکی بسەلمێنین نەك بۆ خۆمان کە ئێمە لە لوتکە داین و هەمیشە شایستەی باشترین.

ئەگەر کەمێك ڕابمێنین دەبینین ئەو پرسیارە چۆنە کە هەوڵ دەدەین وەڵامی بدەینەوە ئەو پرسیارەش کۆمەڵ لێمان دەکات (تۆ کێی؟)، زۆر گرنگی نادەین بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکە کە بە ڕاستی زۆر پێویستی بە وەڵامدانەوە هەیە ئەویش (من کێم؟)، جا وەڵامی پرسیاری یەکەم پەیوەستە بە پێگەی ئیشوکار، ژمارەی بانکی، بەرەوپێشچوونی پیشەیی، لە کاتێکدا وەڵامی پرسیاری دووەم بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بە سەلماندنی کۆمەڵێك بەهای تۆ و ئاشتەواییی دەروونت لەگەڵ خۆتدا و توانات لەسەر بەرەنگاری نەك بیانوو هێنانەوە کە پێی گەیشتی و شانازی پێوە بکەی.

بەداخەوە، کۆمەڵی دەورمان و خوولەکانی پەرەپێدانی خودی ئەوەیان پێ نەگوتین مرۆڤ لەسەر زەوی هەموو ئەوەی دەیەوێت بەدەستی ناهێنێت، دوای ئەوە لەسەریەتی ڕێنیشاندەری خۆی بکات و ڕەفتاری کامڵ بکات، چونکە ئەو لە گەشتی بەرەو جیاوازبوونیدا کۆشش دەکات.

هەروەك پێمان نالێین سەرکەوتن پرۆسەیەکی بەدوایەکداهاتووە و هەنگاوەکانی سەرەتا بە سروشتی حاڵ هێواش دەبن، پێویست ناکات دەروونمان زۆر بشڵەژێنین کاتێك سەرناکەوین یان سەرکەوتنگەلێك بەدەست دەهێنین ناتوانین پێوانەی بکەین، هەروەك کەس گرنگی بە دووپاتکردنەوەی ئەو هزرە نادات، کە

گرنگتر لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن، ئەنجامدانی ئەو کارەیە پێویستە تۆ ئەنجامی بدەیت، بە واتای ئەوەی داوامان لێ کراوە هەوڵ بدەین، هەرچی بەدیهاتنی ئامانجە ئەوە کارێکی ترە، ڕەنگە قەدەر لەبەر دانایییەك، کە ئێمە نایزانین بڕیاری شتێکی تری دابێت، ناخمان بە ئاخ هەڵکێشان سیخناخ نەکەین بەوەی هەوڵمان دا و پێی نەگەیشتین، نەکەوینە تەڵەی ئەو ژیانەی ڕۆڵی قوربانی تێدا بگێڕین و چاوەڕێی قەدەر بکەین ڕووبەڕوومان ببێتەوە.

کۆمەڵی دەورمان گرنگی نادەن بە ئاگادارکردنەوەمان سەبارەت بە بەهای کارە مرۆییەکان و نە گرنگی دەدەن بە ئاسوودەیی لە یارمەتیدانی ئەوی تر، نە بە بەهای قوربانیدان و چاکەویستی، نە گرنگیی بەخشین و کاریگەریی لەسەر ئەوانی تر و نە پاڵفتەکردنی دەروونت لە پێناوی پارستنی گیانت لە شێواوی ژیانی ماددی.

بەپێچەوانەوە، هەموو ئەوەی لە دەورتە هەوڵ دەدات ئەو هزرەت لەبیر بباتەوە، کە بۆ ساڵانێکی دیاریکراو لەسەر زەوی دەژیت، گەورەترین سەرکەوتووەکان، مرۆڤە کاریگەرەکان، کە جیاوازییان خوڵقاند تەنیا جگە لە کارە باشەکانیان کە ژیاننامەکانیان جەختی لەسەر دەکەنەوە و یادیان بەرز ڕاگرتوون و ڕێگەی کەسانی تریان ڕۆشن کردووەتەوە، هیچی تریان لە دوادا نەماوەتەوە.

ئالنگاریی ڕاستەقینە لەسەر زەوی ئەوەیە هەریەك لە ئێمە ببێتە مرۆیەکی چاك، سەر دەکەوێت و بەرەو سەرەوە هەنگاو بنێت بەڵێ، بەڵام سەرکەوتن ئەوەیە هێزی گوزارشتکردنی بەها و بنەماکانی پێ ببەخشێت و هەر هەوڵێك بۆ پێکەوە گرێدانی ئەم ڕاستییەی کۆششی بۆ دەکرێت و بەرهەڵستی دوژمنی پێ دەکرێت، کەواتە بۆچی هەریەك لە ئێمە سوودمەند دەبێت ئەگەر گەورە بێت لە چاوی خەڵکی و بچووك بێت لە چاوی خۆیدا!؟

## گەورە بژی

دەکرێت بپرسین: ئایا گەورەیی پێناسەی هەیە، ڕێگەی ئەدگارەکانی زانراوە، نەخشەیەکی هەیە لەسەری برۆین؟

وەڵامە یەکلاکەرەوەکەم ئەوەیە: بەڵێ!

**گەورەیی بە پێی پێناسەی خۆم ئەوەیە هەریەك ئێمە ببێتە نموونەییەك بۆ ئەوەی هەڵی گرتووە، خاوەنی جوامێری و زیرەکی و ئاگایی بێت، ئەوەی لێی دەبەخشێت بەگوێرەی ئەو ئامراز و بەهرانەیە، کە هەیەتی.**

گەورەیی ئەوەیە هەنگاوی خێرا بهاوێژیت بەرەو ئەو ئامانجەی پێناسەی ڕاستەقینەی خۆتی تێدا دەبینیت، ئەوەیە توانای جیاکردنەوەی ئامانج و ئاوات و مەبەستت هەبێت، ئەوەی ئەوانی تر

هەوڵ دەدەن بیخەنە سەر ئاستی ئاگاییت، ئەمە دەرککردنی تەواوە بە ژیانت و چۆنیەتیی ژیانت.

مرۆڤی مەزن، لە ناخەوە خاوەنی ویستی چاکە و خراپەیە، لە دەروونیدا ئارەزوو و ویستی خراپەی کۆن و خۆشەویستیی خود هەیە وەك تەواوی دروستکراوانی خودا، لەگەڵ دەروونی لە شەڕی بەردەوامدایە تا پەروەردەی بکات، گەورە هەڵە دەکات و تۆبەش دەکات، دەکەوێت و هەڵیشدەستێتەوە، خۆشەویستی دەکات و ڕقیشی لەگەڵ خەڵك دەبێتەوە، ڕووبەڕوو دەبێتەوە و ڕاشدەکات، ئەو بوونەوەرێکی ئەفسانەیی نییە، جگە لەوە تا لەگەڵ کاتی دەستپێکی زاڵبوون بەسەر گیانی و بیرکردنەوە و ڕەفتاریدا، تا کاتێك دێت وای لێ دێت تاکوو هەڵەکانیشی گەورەیە لە تێڕوانینی خۆیدا هاوشێوەی گەورەییەکەیەتی، شەرمناوەر و نەنگیهێن نین، تەنانەت ئەگەر پێویستیان بە پەشیمانی و داوای لێخۆشبوونیش هەبێت.

هاوڕێم گومان دەکەم ئێستا کاتی ئەوە هات بێت کاروبارەکان بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیان ببینین، بەشێکی بێ ئومێدبوونی ڕابردوومان لە زێدە نموونەییبوونمان و هەوڵدانی داواکردنی دەروونی خۆمان و ئەوانی ترەوە بووە بۆ ئەنجامدانی شتانێکی باش بە بەردەوامی و مامەڵەکردن لەگەڵ بەربەستە مرۆییەکان بە شێوەیەکی زیاد لە پێویست توند.

لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان باوەڕبوونی هەریەك لە ئێمە بە نموونەیەکی بەرز لەگەڵ هەوڵدان بۆ بوونە نموونەیی و لەنێوان یەکگرتن لەگەڵ بەها بەرزەکان و داواکاریی ئەوانەی دەوروبەرم تا ببنە چاکەخواز لە هەموو بارێکیاندا، ئەمەیە بارەکەی لەسەر خۆمان و ئەوانی تریش گران کردووە، ئەگەر تەماشای ژیاننامەی پێغەمبەرمان محەمەدت (دروودی خوای لەسەر بێت) کرد بێت دەبینین بەپێچەوانەی ئەوەی هەندێك دەیەوێت تێمان بگەیەنێت ئەو بە کۆمەڵێك لە شوێنکەوتە و هاوەڵانی دەورە درابوو، ڕاستە لە بارێکی بەرزبوونەوەی بەردەوامی دەروونی و گیانی و ڕەفتاری بوون، بەڵام لە کۆتاییدا کۆمەڵێك مرۆڤ بوون، هەڵەیان دەکرد و دەچوونە لای پێغەمبەر تا بۆیان ڕاست بکاتەوە، بانگی دەکردن، هانی دەدان تا لە کەوتنەکاندا هەستنەوە و کاروانەکە تەواو بکەن.

جارێکیان یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر مەی خواردبووەوە هێنایان بۆ لای پێغەمبەر، بەڵێ پێغەمبەر خەمبار بوو و ڕەنگە لە هاوەڵەکەشی توورە بووبێت، بەڵام بە توندی دژی هەر هەوڵێکی ئامادەبووان وەستایەوە سووکایەتی و سەرکۆنەی ئەو پیاوە بکەن.

لێرەدا گەورەیی مامۆستا دەردەکەوێت، سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەر شەرعداڕێژەرە و یاساکان دادەڕێژێت و جێبەجێیان دەکات، بەڵام لە باری لاوازیی مرۆڤایەتی تێگەیشت، درکی بەوە کرد گەورەیی ڕاستەقینە لە مرۆڤدا هەر مرۆڤێك ئەوە نییە لە بوونی خۆیدا بەردەوام چاك و پاك بێت، بەڵکوو بە گوێرەی کۆششی خۆیەتی بۆ

پاککردنەوەی چەپەڵیی گیانی کاتێک دووکەڵی ژیان درێژە دەکێشێت و شەڕی دەروونی لێکەوتەی خراپی دەبێت.

گەورەیی لە پرۆگرامی ئایینی و دونیاییدا بە پێی بینینی خۆم مرۆڤێک نییە لێدانەکانی مردن، کە لەلایەن ژیان و بەرانبەرەکەیەوە پێی دەکەوێت بکێشێت و بە لێدانێکی تێکشکێنەر لە هەموو گەڕەکاندا بباتەوە، بەڵکوو کەسێکە لە زۆربەی گەڕەکاندا دەیباتەوە و توانای بۆ سڕینەوەی شوێنەواری خراپی ڕابردوو هەیە لە پێناوی ئێستا و ئەو ئایندەیەی چاوەڕێی دەکات.

لە کۆنەوە فێریان کردووین خەون بە سەلاحەددینی ئەیوبی و قوتووز* و نورەددین مەحموود**.. ببینین، پێیان گوتووین ئەوانە مەزنی ڕاستەقینەن..

لە هەموو شتێکدا نموونەیان پێشکەش کردووین، باریان قورس کردووین، پاشان ڕاستییەکی گرنگیان فەرامۆش کردووە ئەویش ئەوەیە هەر یەکە لەوانە بە تەنیا سەرکەوتنیان بە دەست نەهێناوە، بەڵکوو بە کۆمەڵێک سەرکردەی تری گەورە دەور درابوون، بەڵام

---

* یەکێکە لە سوڵتانەکانی مەمالیکەکان و ناوی تەواوی (قوتووز مەحموود کوڕی خوارزم شا)یە لە سەدەی سێزدەدا ژیاوە و لە سەمەرقەند لەدایکبووە و لە فەڵەستین کۆچی دوایی کردووە. (و)

** ناوی تەواوی (نورەددین مەحموود کوڕی عیماددەین زەنگی)یە لە ساڵی ۱۱۸۸ لە شاری موسڵ لەدایکبووە و ۱۱۷٤ لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. (و)

مێژوو ستەمکارە، سوورە لەسەر تەرکیز خستنە سەر ((کادیری کامێرا)) و کەسە ڕەمزەکان و فەرامۆشکردنی هەموو ئەوانی تر.

مێژووی ستەمکار کە باسی قارەمانیەتییەکانی شمشێرمان بۆ دەکات و پاڵەوانیەتییەکانی ژیانی شکۆمەندانە لەبیر دەکات. سەرقاڵمان دەکات بە ئومێدی دەستکەوت و گرنگی نادات بە تۆمارکردنی ئەو شکستانەی لە پێشینەی ئەو ڕووداوەدا بوون و بەشێکی بنچینەیی بووە لە بەدەستهێنانی ئەو دەستکەوتە. مێژوو چاوانمان کوێر دەکات تا ببینە بەشێك لەو لە میانەی ئەو بەخشش و قەڵەمبازانە هەڵاوێردکراوانە وەك ئەوەی ئەوە بنچینەی بەرەو پێشچوون و گەورەییە.

جوانە، کەواتە با بزانین مێژووی ڕاستەقینە ئەوەیە لە ئەرشیفی شکۆدا تۆمار دەکرێت و لە تۆماری ویژداندا دەنووسرێتەوە و لە پەڕاوەکانی فریشتەدا دەپارێزرێت و لە کۆتاجاردا لەبەردەم خودادا دادەنرێت.

## لە بەراییدا هاوار هەبوو!

بەڵێ..

**ژیانمان بە هاوار دەست پێدەکات!**

هەموومان دەزانین و لە ساتی یەکەمی بوونمانەوە، بەوپەڕی توانامانەوە بە بەرزترین شێوە دەنگمان بەرز دەکەینەوە. بە دەنگە تیژەکانمان دڕ بە گوێی موژدەپێدراوی گوێگر دەدەین، بە خۆشەویستی و خۆشحاڵییەوە دەستەکان لە خۆیمان دەگرن.

دوای ساڵانێك زۆر بخایەنێت یان کەم، دەستانێکی تر دەمانسپێرنە جێگەیەکی تر، دەکرێت بێدەنگی ناونیشانی ئەو دیمەنە بێت، دەنگمان هیچ بوونێکی نابێت، بێدەنگییەکی خەمبارانە و هەندێك فرمێسك، ورتەورت بە نزای لێخۆشبوون پاشان.. هەموو شت کۆتایی دێت..

هەمانە لەبیر دەکرێت و وەك هەرگیز سەردانی ئەم زەوییەی نەکردووە، کەس یادی ناکاتەوە.

هەندێکی تر یادی لەنێو خۆشەویستان و هاوڕێکانی بەرز ڕادەگیرێت، سۆز و میهرەبانی خوای بۆ دەنێرێت، نزای بۆ دەکرێت ژیانی ئەولای باشتر بێت، لە ئامێزی سۆزی خودای میهرەباندا.

پۆلی سێیەم بە قینەوە یادی دەکرێتەوە، نەفرەتی بۆ دەنێرێت، جەخت لەوە دەکرێتەوە زەوی بێ ئەو ئارامترە!

دوا پۆل دەمێنێتەوە کەمە ئەوەیە کە نامرێت.. کارە مەزنەکان شانازی پێوە دەکەن، ژیاننامەی بەرز ڕادەگرن، خەڵکی یادی دەکەن وەك ئەوەی زیندووە و نەمردووە.

لە هەموو ڕۆژێکدا کەسێك یان پتر لە خۆشەویستانی زیاد دەبێت، بە بەردەوامی بۆ خەڵك دەدوێت، بەرەو چاکسازی ئاراستەیان دەکات، بۆ خوانی مەزنێتی بانگهێشتیان دەکات کە خۆی ئامادەی کردووە، گیانی و خوێن و ڕاستگۆیی خۆی تێدا بەجێ دەهێڵێت.. شتێکی مەزنە!

ئەوانە خاوەنانی پرسێکی گەورەن، پەسەندکەرانی بنەما گەورەکانن، ئەوان خاوەنی هزرە بەرزەکانن، لە گیانی خۆیان دەکەن بە بەریان، خواستیان دەهەژێنێت، ئارەزوویان تاو پێی دەسێنێت، ئازایەتی کڵپە دەدات.

بۆی دەژین و بە ئەوەوە دەژین، بۆیان دەژیێت و پێیان دەژیێت.

ئەوان خاوەنانی بژاردەی قورس و ڕێگەی سەخت و ترسی بەردەوامن..

•

بۆیە بڕیاردان بەوەی بە گەورەیی بژییت، بڕیارێکی ئاسان و سادە نییە، پێویستی بە جۆشدانی گیان و خودت هەیە، سەرلەنوێ بەپێی ئەوەی لەسەری دەڕۆیت و بڕوات پێی هەیە خۆت دابڕژێنەوە، ئەوەی لایەتی...هەمووتان لە یەکتریدا دەتوێنەوە.

## ژیان.. و ئاشتی!

خالیدی کوڕی وەلید (خوا لێی ڕازی بێت) وەکوو جەنگاوەرێکی بەجەرگ ژیا، لە شەڕدا نەشکاوە، نە پێش موسڵمانبوونی نە دوای موسڵمانبوونی، شمشێر لە دەستیدا شکاوە، چەندان ئەسپ لە ژێریدا بوونە، بە بلیمەتیی خۆی چەندان وردەکاریی دەگمەنی لە پلاندانی سەربازیدا داڕشت و چەندان سەرکردەی دانا و سوارچاکی نەترسی پێگەیاند.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی ژیانی سەرشار بوو لە ئەگەری مردن و سەدانجار مردن ڕووبەڕووی بووەتەوە، بەڵام لە هێمنیدا لەسەر جێگەدا مرد، لەبیری نەچوو پێش ئەوەی بۆ دواجار چاوی لێك بنێت گاڵتە بە هەموو ترسنۆکێکی کاریگەر بە ئاشتی بکات و بڵێت:

((ئاوا و ئاوا ماندوو بووم، جێگەی بستێك لە جەستەمدا نییە یا شمشێر لێی دراوە، یا تیری بەرکەوتووە، یا ڕمی پێدا چەقیوە، ئەوەش منم لەسەر جێگەی تازەی مەرگم دەمرم، وەك چۆن حوشتر دەمرێت، چاوانی ترسنۆك ناچنە خەو)).

چاوانێك ناچنە خەو كە دەركیان بەوە نەكردبێت گیان هیی خودایە، ڕێزداریمان بە دەستی خودایە.. بە ترس و لەرزین و شپەرزەیی و بیمەوە بژییێت، پرسێكی نەبێت بۆی بژییێت، یاخود بیروباوەڕێك خۆی بۆ تەرخان بكات تا بالاّ بێت و بژییێت!

خالیدی شمشێری خوا پێمان ڕادەگەیەنێت لەخۆبردوویی زۆر دروستت دەكات، بەڵكوو گەورەیی ڕاسەقینەت پیٚ دەبەخشێت، ئەو هێمایانەی جەنگەكانی ژیان لەسەر جەستەت بەجێی دەهێڵن ئەوانن لە یادەوەریی دونیادا ژیاننامەت دەنەخشێنن و یادت لە زەوی .. و ئاسمان شكۆدار دەكەن.

### ژیانت پرسی تۆیە!

ئەوە دەڵێین: (( پرسی تۆ ژیانتە)) هەردووكی ڕاستە: لە گۆشەیەكی ئاوەزدا بیروباوەڕ و چوارچێوەكان جێگیر دەكات، كە دەمانجولێنن و هەڵماندەسوڕێنن و بەو ڕێگەیەمان دەبەن بڕوامان پێیەتی.

بۆیە ئەمە ((پرسی تەمەنیەتی)) كە دەوڵەمەند بژییێت، ببینێت هەموو شتێك ببەخشێت تا بژییێت.. لەپێناوی پرسەكەی.

ئەو ژیانە پابەند كراوە بە ناوبانگ و ناوهێنان و درەوشانەوەی ئەستێرە، مەرایی بۆ ئەمە دەكات و دوای ئەوە دەكەوێت، دەروون ئارام نابێت تەنیا بە بەدەستهێنانی نەبێت ئەویش.. خەونی تەمەنە.

ئەوی تر تەرکیز دەخاتە سەر ڕۆڵەکانی، پرسی تەمەنی ئەوەیە بە ئارامی و ئاسوودەیی بژین، وا لە خۆی دەکات وەك ئامێر بێ وەستان بخولێتەوە، لەپێناوی ئەوەی ژیانێکی شایستەی ڕێزدارانەیان بۆ دابین بکات.

**ئەوەی پاڵم پێوە دەنێت پرسیارت لێ بکەم، ئەرێ تۆ و... پرسەکەت چییە؟**

**ئای بۆ لەدەستچوونی تەمەن ئەگەر وەڵامدانەوەکەت ئامادە، ڕوون، ئاشکرا نەبێت..**

**ئای بۆ لەدەستچوونی دووەم ئەگەر وەڵامدانەوەکەت بە گوێرەی خواست یان ویست یان ئاگاییت نەبێت.**

**ئای بۆ لەدەستچوونی سێیەم ئەگەر پرسەکەت ژیانت نەبێت! یان لە هەمان خانەی دونیادا بێت لە ویژداندا.**

**لەبارەی ژیانەوە پرسیار لە گەورەکان بکە و پێت ڕادەگەیەنین بە چارەسەری ناوەند ڕازی مەبە!**

**تۆ یان گەورەی یان ئەوە نیت.**

گەورەیی وشەیەکی ناوەڕۆك بەتاڵ نییە، بە سادەیی گوزارشت لەو بیروباوەڕە دەکات، کە پێی دەژییت و ئەو هزرەیە بۆی دەژییت،

پێم بڵێ بە چ شتێك دەژییت و بۆی دەژییت، ئەوا ڕادەی گەورەییت پێ دەڵێم.. بەمجۆرە بارەکان هەڵدەسەنگێنرێت!

هاوڕێم مرۆڤ ناگاتە سنووری مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە ئەگەر بڕوای بە مزری گەورەیی نەبێت و هەوڵی خۆی نەخاتە گەڕ لەپێناوی سەرکەوتنیدا.

هەروەك ((مارتن لۆسەر کینگ))* جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە **((مرۆڤ ئەگەر شتێك نەدۆزێتەوە لە مردن بەرگریی لێ بکات ئەوە شایانی ژیان نییە)).**

## شوێنێك بۆ خۆت بگرە!

لەوانەیە بڵێیت: بارودۆخی ژیان کۆتی کردووم و شەڕە ستەمکارەکانی زەفەریان پێ بردووم.

دانی پێدا دەنێم ژیان سەختە و بارودۆخەکان قورسن، بەڵام ئەمە شتێکی نوێ نییە!

---

* چالاکێکی ئەمریکیی بەڕەگەز ئەفریقایی بوو لە بواری مافەکانی مرۆڤدا، لە ١٩٢٩ لە ئەمریکا لەدایکبووە و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە بۆ ئاشتی، لە ١٩٦٤ تیرۆر کراوە. (و)

** عەنتەرەی کوڕی شەداد کوڕی قەڕادی عەبسی لە ٥٢٥ی زایینی لەدایکبووە، یەکێکە لە شاعیرە عەرەبەکانی پێش ئیسلام و بە شیعری سوارچاکی بەناوبانگ بووە و بە یەکێك لە سوارچاکە بەناوبانگەکان دادەنرێت، لە ٦٠٨ کۆچی دوایی کردووە.

ئەم سروشتی ژیانە و ناگۆڕدرێت، کە مەینەتی و ڕەنج و ماندوویی و ناڕەحەتییە..

بەڵام ئەی هاوڕێم، تۆ بەو جۆرەیت، کە پێگەی خۆت دیاری دەکەیت، ئەگەر ژیانت بەو جۆرە نەگوزەراند کە ئارەزووی دەکەیت، ئەمە سروشتی ئەوە ڕێنیشاندەرەکانی ژیان هێشتا جەخت لەوە دەکەنەوە خاوەنانی مەبەستە گەورەکان نە مەرجەکانی ژیان قبوڵ دەکەن و نە بە ئاسانی بە مۆڵەتەکانی بارودۆخەکان ڕازی دەبن..

**گەورەییبان زۆر سەختترە لەوەی بە لێدانەکانی ڕۆژگار بشکێن!**

**تۆ و نموونەیەك بە ناوی ((عەنتەرە**))!**

لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا عەرەب ناودارترین سوارچاکی خۆی لە مێژوودا ناسی و ئەویش ((عەنتەرەی کوڕی شەداد))ە، باوکی سوارچاکان، ئەوەی ئاهی سەرسووڕمانی بۆ هەڵدەکێشرێت و سەرسامن بە شیعرەکانی، بە شمشێرە بڕەرەکەی بەرزی و شانازی نیشان داوە، ئەوەی یەکەمین کەس بووە داد و داوای بۆ براوە و دوایین کەس بووە بیری لە دەستکەوتی جەنگ دەکردەوە ئەگەر دابەش بکرایە.

**ئەوەی شەڕی بینی پێت دەڵێت کە چاوپۆشیم لە شەڕ کرد و دەستم لە دەستکەوت هەڵگرت.**

ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە ((عەنتەرە)) وەك کۆیلەیەکی ڕەشپێست لەدایکبوو، زانینەکەی شەفاعەتی بۆ نەکرد، کە کوڕی یەکێك لە خانەدانەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبییە ((شەدادی کوڕی عەمرو کوڕی مەعاویەی کوڕی مەخزووم)).

تەنانەت هیچ پیاوێکی نەجیبزادە دانی پێدا نەدەنا دوای ئەوەی یەکێك لە کەنیزەکان گرتیە خۆی، بەڵکوو بە بەندەش بانگی دەکرا.

((عەنتەرە)) ژیا و هەستی بە نامۆیی دەکرد، لە ماسولکەکانیدا خوێنی ئازایەتی دەگەڕا، لە هەمان کاتدا لەسەری نووسرا بوو بە کۆیلەیی بژیێت، ((عەنتەرە)) خۆی ڕادەستی باری واقیع نەکرد، یاخی بوو، فێری شمشێروەشاندن بوو، وەك سوارچاکان ڕمی دەهاویشت، بەڵکوو بە شێوەیەکی هەستپێکراو زۆریش بەسەریاندا زاڵ و سەرکەوتوو بوو، فێری شیعر بوو و لە هەموو شاعیرانی سەردەمەکەی دەرکەوتووتر بوو، بە ئامادەگییەوە دادەنیشت و چاوەڕێی هەلی دەکرد.

تا ڕۆژێك خۆی و هۆزەکەی لە شەڕێکدا دەستکەوتیان بەرکەوت، لە کاتی دابەشکردنی دەستکەوتەکە، بەشی خۆیان بۆ نەنارد و گوتیان: وەکوو شەرکەرانی ئێمە بەشی ناکەوێت، چونکە کۆیلەیە، لەو کاتەدا ((عەنتەرە)) سەیری باوکی کرد هیچ کاردانەوەیەکی لێ نەبینی، بۆیە بە تەنیا و دوور لە ئەوان دانیشت، تەنیا سەعاتێك ڕۆژ

مابوو و تیرەی ((تەی)) دای بە سەریاندا و هۆزەکەی ((عەنتەرە))ی پەرت کرد، کوشتار و برینداریکی زۆری لیّ کردن، ((عەنتەرە)) بە نیلەی چاوی سەرنجی باوکی دا داوای بە هاناوە چوونی لیّ دەکرد و پێی دەگوت: ئەی ((عەنتەرە)) هێرشیان بۆ بەرە، ((عەنتەرە)) شانی هەڵتەکاند و گوتی: بیرت چوو، من کۆیلەم، کۆیلە بۆ هێرشکردن گونجاو نییە، بەڵکوو بۆ شیردۆشین و بەستنی گوانی ئاژەڵان گونجاوە (**واتە کاری بەردەست**)، باوکی پێی گوت: کۆیلە جگە لە تۆیە، کۆڕم هێرش بەرە و ئازاد بە.

لێرەدا ((عەنتەرە)) ئەو هەلەی قۆستەوە کە چاوەڕێی بوو.. بە درێژاییی تەمەنی بە ئازادی ژیا، ئەمەش دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر خۆی بۆ چنگخستنی ئەو دەرفەتە ئامادە کرد.

**ئەی هاوڕێم ڕەنگە بارودۆخەکان بە پێچەوانەی ئەوەی ئارەزووەکانت دەیەوێت بڕوات.**

**ڕەنگە بەربەست هەبن، کۆسپ لە ڕێگەتدا هەبن، بەڵام ئاڵنگاریی ڕاستەقینە توانای تۆیە لە بەگەڕخستنی ئەو ئومێدەی لە ناختدایە کە بەسەر ئەو داڕمانەی لە ئاسۆوە دەرەوشێتەوە، بڕوام پێ بکە هەموو داڕوخانەکانی جیهان ناتوانن شکستت پێ بهێنن مادام نەگەیشتووەتە ناخی گیانت، وەك ئەوەی هەبوو.. ((عەنتەرە)).**

## نەکەی لاواز بیت..

بەرانبەر لێدانەکانی ژیان و نیشانەکانی دوژمن و تۆمەتەکانی لایەنی بەرانبەر.. پێویست ناکات هەرگیز وەك بێهێزێك لای خوا سکالا بکەیت.

خوا نزای داوای پشتبەستن پێی، هانابردن بۆ هێزی، پەنابردن بۆ هێمنیی ئەوی خۆش دەوێت، بەڵام خوا ناوی شکۆدار بێت ڕقی لە نزای ملکەچی لاوازی سەرشۆڕی دەبێتەوە..

گێردراوەتەوە ڕۆژێك دوو کەس لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ناکۆکییان دەبێت و پێغەمبەر قەزاوەتی بۆ کردن، ئەو پیاوەی بڕیاری بەسەردا درا گوتی: ((خوا بەسمە و ئەو کارجێبەجێکەرێکی چاکە)).

لێرەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: خوا سەرزەنشتی لاوازی دەکات، بەڵام لەسەرتە وریا بیت، ئەگەر بارودۆخەکان بەسەرتدا زاڵ بوو، بڵێ: خودا بەسمە و ئەو کارجێبەجێکەرێکی چاکە.

خوا سەرزەنشتی لاوازی دەکات، سەرزەنشتی سرەوتن دەکات، سەرزەنشتی کەم توانایی دەکات.. سەرزەنشتی بێهێزی و بێ هەڵویستی دەکات دەکات.

پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕووی تێ دەکات و دەفەرموویت: **((لەسەرتە وریا بیت، لەسەرتە ژیر و خاوەن پلان بیت، لەسەرتە هۆکارەکان بەکاربهێنیت، بە سەرشۆڕی و فەتاوی دەست لە خۆت بەر مەدە))..**

پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەگەڵیدا ئامۆژگارییەکە کۆتایی پێ دەهێنێت بەوەی ئەگەر کاروبارەکان بە جۆرێك کەوتنەوە، ئەگەر سەرکەوتنت بەدەست نەهێنا لێرەدا دوای ئەوەی هەوڵت دا لەوەی لەسەرت پێویست بوو لە کۆششکردن .. و لێرەشدا کارەکان بە تەواوی بخە دەستی خواوە و دەست لە توانا و هێزت هەڵگرە..

**ئەی هاوڕێم.. خوا ڕقی لە لاوازییە.. بەم دەستەواژانە لە دەرگەی ئاوەز و دڵت دەدەم..**

**شکست مەخۆ.. چون خوا ڕقی لە لاوازییە..**

**خۆت بە دەستەوە مەدە.. چون خوا ڕقی لە لاوازییە..**

**خوا باوەڕدارانی خۆش دەوێت.. و باوەڕدار وریای زرنگە..**

باوەڕدار ئاوەزی بە گوێرەی تواناکانی کار دەکات، ئەگەر ویستەکەی هاتە جێ سوپاس و ستایشی خوا دەکات، ئەگەریش

سەر نەکەوت دەرك بەوە دەکات سەرنەکەوتنەکەی بە تەواوی خۆی پێوە بووە..

ڕێچکەی گەوران و چاکسازان بەم شێوەیە بووە.

لەگەڵ هەموو ئەو لافاوە بە تەوژمەی دڵتدا.. لە چاو ناختدا بچووکە!

سەیرە وا ببینیت کێ لەناوماندا لە قەوارەی سروشتیی خۆی گەورەترە، لە سەیر سەیرترە کەسێك بدۆزیتەوە لەگەڵ ویستەکانیدا ڕاست بکات، توانای لە چاو خۆیدا بوختان و هەڵبەستراوە.

ئەوە گرنگە لە چاویدا گەورە دەبێت، جگە لەوەی لە چاوی خەڵکیدا .. بچووکە.

گەورە بە ڕاستی خەریکی سنووری گەورەییی خۆی نابێت، تەنیا ئەگەر لە قەوارەی سروشتیی خۆی دەربچێت.

زۆر متمانەمان بە خۆمانە، هەر چۆنێك بێت متمانەی متمانەدار لە باشیی هەڵوێستییەوەیە، دڵنیایە لەو سەرکەوتنەکەی و پشتیوانی ئەو ڕاستییە، کە هەڵی گرتووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەوە دەزانێت ئەگەر چاودێریی خوا نەبێت نیشانەی سەر ڕێگەی لەبەر چاو ون دەبێت و ڕێگە هەڵە دەکات.

میهرەبانیی خوا بۆ ئەوەی گوتوویەتی: ((**سەرسامبوون ڕێگرە لە زیادبوون**))، هەر کاتێك سەرسام بووی بەوەی پێشکەشت کردووە و کردووتە، ئەوا نە زانستت زیاد دەکات نە بەرز دەبیتەوە و نە بەرەو پێش دەچیت، زانست پێویستی بە خۆدامالین و خاکیبوون و دەرککردنی تەواوە بەوەی ئێمە لە جیهانی تێگەیشتن و زانین بچووکین. خوا پلەی ئەو شوێنکەوتووە ڕێزدارەی پێغەمبەر بەرزتر بکاتەوە کە لە گرنگیی سەرکۆنەکردن دەروون و بچووککردنەوەی و ترسان لە دەروونمان ئاگادارمان دەکاتەوە بە گوتەی:

**((چاوم بە چل هاوەڵانی پێغەمبەر کەوت کەسیان نەبوو گومانی ئەوەیان نەبێت کە دووڕوون))!**

**ئای ئەی هاوڕێم..**

چل هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەریان بینیوە و لەگەڵی ژیاون، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان دەخەنە ناو بازنەی سەرکۆنەکردنەوە لە ترسی ئەوەی نەك خۆبەگەورە زانین و شانازی و بەخۆ سەرسامبوونیان لێ دەربکەوێت و نەتوانن بیشارنەوە..

پێویستە لەسەرمان هەردەم دڵنیا بین لە ناخمان کە ئێمە بچووکین، ئەگەر مەزن بووین ئەوە گەورە دەبین و باڵا دەبین و گەورەبوون ئەو مەبەستەیە هەوڵی بۆ دەدەین و بە ڕاستیش کار بۆ بەدەستهێنانی دەکەین.

## لەبارەی بەڵگەی گەورەییتەوە بۆم بدوێ

باری خەڵکی سەیرە، لەبارەی کاروباری زۆرەوە قسە دەکەن، دەربارەیان دونیا پڕ دەکەن لە قسە، بەڵام لە ناساندن و وردەکاری و ڕوونکردنەوە.. شتێك دەڵێن و مەبەستیان شتێکی ترە..

جگە لە پێناسەیان بۆ ئاسوودەیی و باڵابوون و دڵنیایی و گەورەیی!

پرسیار لە هەزار مرۆڤ بکە، هەزار وەڵام دەدرێیتەوە بی ئەوەی هیچ وەڵامێك هاوشێوەی ئەوی تر بێت، ئەمە ڕوویەکی نەرێنی و دیوێکی ئەرێنی هەیە..

هەرچی نەرێنییەکەیە ئێمە ناتوانین بگەینە بە ڕێگەی گەورەیی و باڵایی کە وردەکارییەکانی بە ڕوونی نازانین، بێ ئەوەی نەخشەیەکمان هەبێت کاتێك شتێك لە زەینمان ئاڵۆسکا سەیری بکەین یا نیشانەکانی سەر ڕێگە ڕوون نەبوو..

بەڵام لایەنی ئەرێنی ئەوەیە زۆری ڕێگە گەیشتن بە مەبەستە بەرزە شکۆمەندەکان، پانتایەکی فراوانمان پێ دەبەخشێت بۆ جیاوازی و هەمەجۆری، ئەو جیاوازییەی زەوی جوان دەکات، ئاوەدانییەکانی ڕازاوە دەکات، ئیلهامی ڕێگەی داهێنەرانەی ناوازەمان بۆ دێت و لە دەروونی خۆماندا دەدۆزینەوە بە گیانمان پێدا بەرەو سەرەوە دەچین..

ئاڵۆزیەکی تری مەترسیدار دەمێنێتەوە.. ئەویش لەبارەی چەمکی گەورەییە لە زەینی هەندێکدا و پەیوەستیی ئەوە بە هەڵسانە مەزنەکان و بازدانە بەهێزەکان و هەنگاوە گەورەکانەوە، ئەمە ناسناوی ((گەورە))ی پێ نادرێت تەنیا ئەوە نەبێت دەنگی لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن دەبیسترێت و ناوی بە هەڵکۆڵراوی لە یادگەی دونیادا و وێنەی بە نەخشکراوی لە هۆشیاریی خەڵك دەمێنێتەوە..

**نەخێر.. ((گەورە)) تەنیا ئەوە نییە شتە گەورەکان بە گەورەیی ئەنجام بدات..**

**((گەورە)) ئەوەیە شتە سادەکان بە خۆشەویستییەکی گەورەوە ئەنجام بدات!**

ئەو جووتیارەی بە ئارەقەی ناوچەوانی زەوییەکانمان ئاودێر دەکات و شەو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی لە چاندن و بەربوومەکەی لە خواترسانی هەیە.. ئەوە مرۆڤێکی مەزنە..

ئەو مامۆستایەی پێشوازی لە نەوەکانمان دەکات تا ڕێگەکانی پێشکەوتن و بنەماکانی زانین لە ئاوەزە کراوەکانیان بنەخشێنێت.. ئەوە مرۆڤێکی مەزنە..

ئەو شۆڕشگێڕەی ستەم ڕەت دەکاتەوە.. ئەو فەرمانبەرەی نیازی ڕاستگۆییە.. ئەو فێرخوازەی بە دوای زانین و زانستەوەیە.. هەر یەك لەوانە گەورەن..

لێرەدا گوێم لە پرسیارێك دەبێت و بە سەرسووڕمانەوە دەڵێت: کەواتە هەموو خەڵکی گەورەن؟!

**بەوە وەڵامی دەدەمەوە دەڵێم: بەڵێ.. بۆ نا.. لە لێکچوواندنی ئەوانەی پێشەوە ڕوونە!**

## ڕووگەنمای گەورەیی

دەرفەتم پێ بدە لەگەڵت بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی قسەکانم بەوە دەست پێکرد هەر یەك لە ئێمە پرسێکی بۆی بژییێت.

لە گەورەیی و بچووکیدا جیاوازیی هەیە، هەموو ویستێك خاوەنەکەی هەڵی دەگرێت بەو پێیەی شایستەیە.

بەڵام پێم خۆشە تیڕوانینی خۆمت بە شێوەیەکی جیاواز پێ بڵێم، بە هەندێك وردەکارییەوە.

**وای دەبینم مرۆڤ لە چوارگۆشەی ((ویستەکان))دان لە نێوان ئەم چوار چوارگۆشەیەدا:**

| ١ (ویستە هیچەکان) | ٢ (ویستە ئاساییەکان) |
| --- | --- |
| پرسەکەت بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانتە، گرنگی بە مرۆڤەکانی تر نادەیت، گرنگ خۆتی، ئەگەر دڵنیا نەبیت سوودێکی ڕاستەوخۆی خۆتی تێدا نییە، بەرەو لای ناچێت. | ئەوەیە زۆرێك خەڵکی تر تێیدا هاوبەشن، وەك پەروەردەکردنی نەوەکان، دابینکردنی پێویستییەکانی ژیان. |
| ٣ (ویستە شکۆمەندەکان) | ٤ (ویستە گەورەکان) |
| خزمەتێکی مەبەستداری مرۆییی شکۆمەندایە، وەك لابردنی ستەم لەسەر مرۆڤ یان دابینکردنی خۆراك و پۆشاك بۆ هەژاران... هەر شتێك کە هەستی مرۆڤایەتی دەجوڵێنێت، ئەنجامدانی شکۆمەندییە. | ئەو مەبەستانەن قووڵاییەکی ئایینییان هەیە، خزمەتی ئامانجێکی شکۆمەندی پایەبەرز دەکەن، لە هەمان کاتدا خاوەنەکەی نیازی ئەوەیە هەموو ئەوەی پێشکەشی دەکات بۆ ڕەزامەندیی خودا و بەرزڕاگرتنی ئایینەکەیەتی. |

هەر یەك لە ئێمە لە چوارگۆشەیەك لەم چوارگۆشانەدایە و بە پێی گۆڕانی قەناعەت و ویستەکانی لە نێوانیاندا جێگۆڕکێ دەکات.

**بەڵام حەز دەکەم ئاماژە بە هەندێك خاڵی گرنگ بدەم تاوەکو تێڕوانیم لات ڕوون بێت:**

**ئەوەی یەکەم:** ئەوەی من بە ئاسایی دەبینم تۆ بە شکۆمەند دەیبینیت و ئەوەی من باوەڕم بە گەورەیی هەیە مەرج نییە هەمان پێگەی ناوازەی لە دڵتدا هەبێت، لەبەرئەوە لە چاکە و میهرەبانیی خوایە وای کردووە تێڕوانینمان جیابێت، بۆیە ویستەکان و پرسەکانمان فرەیە، لەمەوە دەوڵەمەندی و هاندان دێتە کایەوە و ڕێگە لە بۆشایی و کەلێنیش دەگرێت، مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی تەواو لەسەر بنەمای پێویستیی هەر یەك لە ئێمە بۆ هەوڵدانی خاوەنەکەی و تێڕوانینی و بەهرەکەی تەواو دەکرێت.

**دووەم:** هەموو مرۆڤێك لەبارە بۆ ئەوەی بۆی دروست کراوە و ویستی مرۆڤ ئەگەر ئەوەی هەڵی گرتبوو مەیلی لێ نەبوو، ئەوا بێ داوا و خواست دەستەوەستان دادەنیشێت.

بە واتای ئەوەی خوا توانای دەروونی یا جەستەیی یا ماددی پێ دا پاڵی پێوە دەنێت بۆ ناوازەیی و بەرەوپێشچوون و بەرزبوونەوە، هۆشیارییەکی قووڵ و تێڕوانینێکی هاوسەنگی هەیە، توندە لە بەرانبەر پێشهات و گرفتەکان، بەمە دەتوانێت سەر لە هەور بسوێت و ویست و بەهرەکانی بنووسێتەوە و چاکەی بەسەر هەموانەوە هەبێت.

**ئەمە شایستەی ئەوە نییە لە کەسانی چوارگۆشەی یەکەم و دووەمدا بێت.**

هەرچی ئەوەی خوا توانای ئاوەزی و دەروونیی دیاریکراوی پێ بەخشیوە، لە چوارگۆشەی دووەمدایە و ئەوەش ئەوپەڕی تواناکانیەتی و مەبەستی هێندەیە، ئەوەندەی بەسە خانوویەکی باش و گونجاو دروست بکات و ڕۆڵەکانی چاك پەروەردە بکات، بەمە ڕەنگە کەمترینی ئەوە ئەنجام بدات، کە خوا لەسەری پێویستی کردووە.

ئەو ئاڵنگارییانەی، کە ڕووبەڕووی کەسانی چوارگۆشەی یەکەم دەبێتەوە بەو ڕادەیە نییە، کە ڕووبەڕووی کەسانی چوارگۆشەی دووەم دەبێتەوە، هەردووکیان بە ئاستی ئەو مەترسی و ئاڵنگارییانە نییە، کە ڕووبەڕووی کەسانی دوو چوارگۆشەکەی دیکە دەبێتەوە، بۆیە گەورەی ڕێزدارمان ((محەمەد غەزالی)) ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی ((**سەختییەکانی ژیان لە ویستەکانی گەورە پیاوان هەڵدەکشێت و دادەکشێت**))، لەسەرتە خۆت بخەیتە ئەو شوێنەی بۆی دروست کراویت.

ئەوە ماوە بڵێم لە زیرەکیی مرۆڤ ئەوەیە خۆی بخاتە شوێنی دروست، یان وەکوو پێشەوا ئیبنو جەوزی[*] (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گوتەیەتی: **((پێویستە لەسەر مرۆڤ بگاتە ئەو مەبەستەی لە توانای دایە، ئەگەر مرۆڤ بیتوانیایە بگەیشتبایە بە ئاسمانەکان، ئەوا کەموکوڕی بوو بۆی لە زەوی بمابایەتەوە)).**

**چاککردنی میللەت و نەتەوەکان پێویستی بە تاکگەلی گەورە هەیە لەنێوانیاندا بجەنگن، بۆ ئەوەی قەوارەیەکی پتەو و بەهێز دروست بکەن، لە هەموو مەترسییەك مەترسیتر ئەوەیە خاوەنانی بەهرە و توواناکان و لێهاتووییەکان پاشەکشە بکەن و بە ڕۆڵی بچووك ڕازی بن لە ژیاندا و گۆڕەپانەکە بۆ کەسانێك بەجێ بهێڵن کە کەمتر توانای سەرکردایەتیکردنیان هەیە. خودا پلەی نووسەر ((مستەفا سادق ڕافیعی))[†] بەرز بکاتەوە ئاگاداری کردوویینەتەوە بەوەی: ((هەروەك چۆن کەسانی خراپ، کە خراپە دەکەن زیان بە خەڵکی دەگەیەنن،**

---

[*] زانا و فەرموودەناس و مێژوونووس بووە، ناوی تەواوی ئەبو فەرەج عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبو حەسەن کوڕی محەمەد قورەشیی تەمیمی بەکرییە، لە ١١١٦ لە بەغدا لە دایکبووە و کۆمەڵێك بەرهەمی هەیە و لە ١٢٠٠ هەر لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. (و)

[†] نووسەرێکی میسرییە، ناوی تەواوی مستەفا سادق کوڕی عەبدولڕەزاق ڕافیعییە، لە ١٨٨٠ لەدایکبووە و زیاتر لە ٢٠ بەرهەمی هەیە و لە ١٩٣٧ کۆچی دوایی کردووە.

کەسانی چاکیش کاتێك لە چاکەکردن دەوەستن زیان بە خەڵکی دەگەیەنن)).

## گەورە بژی

ژیانی گەورە هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێك

هەڵویست و ڕەفتارگەلی ڕاست، بە کۆڵنەدان و بەردەوامی دەگۆڕدرێت

بۆ نەریتی چەسپاو و ئاکاری دروست و ڕەفتاری دیار و بەرچاو.

## ١. چاو ببڕە ئەستێرەکان

**گەنجێکی ئەندەلووسیی هەژار ((محەمەدی کوڕی ئەبوعامر)) وەستا و تەماشای کۆشکی زەهرای شوێنگەی خەلافەت و جێگەی دیداری پیاوانی حکومەتی لە ئەندەلووس دەکرد، هاوڕێکەی بەزەیی پێدا هاتنەوە و بە خەندەوە پێی گوت: ئەی محەمەد سەیرکردنی ئەستێران بینایی چاو دەبات و بێهێزی دەکات!.**

کوڕی ئەبوعامر وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی دایەوە و پێی گوت: بەڵکوو بەهێز و تیژی دەکات!.

ئەو گەنجە خاوەن ویستە ڕاستی کرد، هەوڵدانی بۆ پایەی بەرز وای کرد ویستەکانی لە دڵدا تاو بسێنن و خواستەکانی گڕ بگرن و پاڵی پێوە بنێنن بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەختی و ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکان.

لەبەر ئەوە سەیر نییە ئەم گەنجە هەژارە داماوە دوای چەند ساڵێك لەسەر کورسیی دەسەڵات دادەنیشێت و لە مێژوودا ناوی خۆی وەك پاڵەوان و سەرکردە.. و جێنشین دەنووسێتەوە.

ئامۆژگاریم بۆت ئەوە نییە چاوبڕینە پایەی بەرز تەنیا ئەندێشە و وەهمی جوان بێت، بەڵکوو ئەمە ڕاسپاردەیەکی پیغەمبەرانەی قووڵە

بۆ شوێنکەوتووانی ئەم ئایینە، هەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) جەختی لێ دەکاتەوە بە گوتەی:

**((خودا پایەرزیی و شکۆمەندیی کاروبارەکانی خۆش دەوێت و ڕقی لە بێ بەهاییی کاروبارەکان دەبێتەوە)).**

خوا ویستن و بەرەو پێشەوەچوونی خۆش دەوێت، هەروەها پەیوەستبوونی دڵ بە مەبەستی شکۆمەندی پایەرزی مەزنیش..

ڕقی لە مردوویی ویست و لاوازیی خواست و کەمی و هیچی مەبەست و داواخوازییەکان دەبێتەوە..

هەروەك چۆن لە پێشوو بۆم ڕوون کردیتەوە گەورەیی مانای ئەوە نییە پێویستە ببیتە ئامانجی فلاشی کامێرا و دەرکەوتنی سەر شاشەکانی تەلەفزیۆن، بەڵکوو گەورەییی ڕاستەقینە ئەوەیە بە سووربوونەوە کۆشش بۆ کارێکی شکۆمەندانە بکەیت، هەوڵ بدەیت لە ئەنجامداندا داهێنەر و ناوازە بیت.

**ئەی هاوڕێم خوا هیچ کەسێك ڕاناسپێرێت بە شتێك کە نەیتوانێت، بەڵام ئەوە ئێمەین کە وا دەکەین..!**

جارێك داوای شتێك دەکەین، کە پێویست ناکات داوای بکەین، جارانی تر ئەوە دەکەین کە بە واقیع ڕازی بین و ویستەکان ڕەت

بکەینەوە و خۆمان بە قەناعەتهێنان بە کەمترین و نزمترین ڕابهێنین..

هەندێك لە ئێمە ئاسوودەیی لە هەبوونی پەناگەیەکی ئارامدا دەبینن، بەرەنگاریی سەختییەکان نابنەوە و ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەکان نابنەوە تا بە هێمنی ژیانیان کۆتایی دێت.. کۆتاییەکی هێمن!.

بەبێ ئەوەی ئاگاداری بوونی خۆی بێت لەسەر زەوی.. دوای ماوەیەك یادی لەبیر دەکرێت، لەبەرئەوەی هیچ شکۆمەندییەکی نییە تا لە بیرەوەریدا جێی خۆیی بکاتەوە و بە شکۆدارییەوە بوەستێت بۆ ئەوەی پێشکەشی کردووە و دروستی کردووە..

خوا پلەی ئەو شاعیرە زرنگە بەهەستە بەرز بکاتەوە، کە ئاگادارمان دەکاتەوە حەوانەوەی ڕاستەقینە لە دەستبەرداربوونی ماندوویی و مەترسی و بەرەنگاربوونەوە نییە، بەڵکوو حەوانەوە بەوانەوەیە، بۆیە دەڵێت:

بۆ حەوانەوەی گەورە چاوی کردەوە، نەیبینی

تەنیا لەسەر پردی ماندوویی بەدەست دێت

سەیری دەربڕینی ((حەوانەوەی گەورە)) بکە و بۆ تێڕوانین ((حەوانەی بچووك)) یش هەیە کەمبینا و دوورنەبین پەنای بۆ

دەبەن، لە ژێریدا پەنا دەگرن، پشکێکی گەورە و چاکەیەکی بێ ئەژمار لە دەستی خۆیان دەدەن.

ڕەنگە خوێنەری بێزار بڵێت: ماندوو بووین لە زۆری قسە و تیۆر، تێر بووین لە هاندان و ئازایەتی، قسەیەکی کرداریمان دەوێت..!

خودا کارت ڕاست بهێنێت ئەی هاوڕێی ناڕازیم..چەند جوامێر و شیرین و جوانیت..!

تەواوە.. نە پەیڤ سوودی هەیە و نە پیت بەهای هەیە، نە هاندانیش پەرجووی هەیە، مادام بەهۆیانەوە بەرەو بەرزی ناچین، ئەم ئازایەتییە هەڵقولاوە بکە بە نەخشەی کار و هەنگاوی کرداری، ئەی هاوڕێم ئەمەش ئەرکە سەختەکەتە..

مامۆستاکانمان لە قوتابخانە فێری پیت و پەیڤیان کردین، بەڵام ئەوە ئێمە بووین ڕستە و دەستەواژەمان ساز کرد، ئەوان دەرگەیان کردەوە و ئێمەش ئەوانە بووین ڕۆیشتین و چووینە ژوورەوە..

لە دڵی هەر کەس لە ئێمەدا خەون هەیە..دەتوانم لەسەر ئەمە سوێند بخۆم..

بەڵام هەندێك ئەوە نازانن خەونەکان پەیوەستن بە ویستی خاوەنەکانیان..!

یەکێك لە دانایان دەڵێت: (( **خەڵکم جیا نەکردووەتەوە تەنیا لە ویستەکانیاندا نەبێت، ئەوەی ویستی بەرز بوو‌بێت پلەی بەرز بووە، کەس نەبووە مەگەر لە ویستەکەی ڕازی بوویم**))، ئەم وشانە چەند کاریگەر و ڕاستن، کاتێك ویستت دەبێت.. ئەو کات لە بازاڕی گەوران بەهات دەبێت.

ئەی هاوڕێم کێشەی گەورەمان ئەوەیە بڕوامان بە خەونەکانمان نییە، ڕێزیان ناگرین، بە ڕاستیان نازانین، ئەگەر وابایە دەبوایە لە هەموو دەرگەیەکمان بدایە، پرسیارمان لە هەموو خاوەن زانستێك دەکرد، بە دوای ئەو هێز و ڕێگە و ڕێبازانەدا دەگەڕاین و دەماندۆزیەوە، کە دەمانگەیەنێتە خەونەکانمان.

جا لەبەرئەوە دەتانبینین زۆر دڵخۆش دەبین و ئێمە دەخوێنینەوە یا دەبیستین بەپێی ئەو شتەی بەرەو لوتکە هەڵمان گرتووە، پاشان بە سەختی و توندی لەگەڵ واقیعدا پێکدا دەکێشن، تووڕە دەبین و قسەکەر تۆمەتبار دەکەین بەوەی نموونەییە و ژیان بە شێوەی ڕاستینەی خۆی نابینێت، بۆ ئێمە شایانترین کار ئەوەیە ئەوەیە ئێمە سەرەتا ڕێزی خەونەکانمان بگرین، پاشان سۆراغی ئەو ڕێگەیەمان بکەین ئەو خەونەی لێیەوە بەدی دەهێنین.. **ڕێگەم بدە پرسیارێکی ڕوونت لێ بکەم: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) چی بە هاوەڵانی بەخشی بەتایبەتی لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا؟**

## قسەیەك، بەڵێنێك، مژدەیەك.. بەم جۆرە بوو..؟!

بڵێن لا إله إلا الله سەرفراز دەبن.. ئەمە بانگەوازەکەی بوو.. بە سەرکەوتنی ئایندە هانی دان، بە بەهەشتی بەڵێنپێدراو، بە کردن جێنشین و بەرزی..

پیاوێك لە هۆزی قورەیش گوێی لە قسەکەی دەبێت و لە ئاوەزیدا دەیکێشێت، دەچێتە تۆمارەکانی بیر و سۆزی لەگەڵ ئەو هزرەی ئەو پیاوە سادە لاوازە خستیە ڕوو لەو کاتەدا باوەڕ دەهێنێت یان ڕەتی دەکاتەوە.

**ئەگەر بڕوای بەو هزرە کرد و لە ناخیدا پێگەیەکی بەرچاوی داگیرکرد، دەرکی بەوە کرد ئەوەی لە ڕابردوو ڕوویدا شتێکە و ئایندە شتێکی ترە، ئەوا قۆڵی لێ هەڵماڵی و خۆی ئامادەکرد بۆ ماندوویی و سەختییەکان، ئازاری دەکێشا مادام لە پێناوی سەرخستنی هزرەکەی و هێنانە دی خەونەکەیەتی..**

هەمان شت لە ژیانی هەموو کەسێکدا بەدەست دێت، کە بڕوای بە خەونەکەی و وەدیهێنانی هەیە، سەرەتا بە وشەکانی لە هزرەکان دەدات لەبارەی حەوانەوە و سرەوتن، بۆیە ڕووگەنمای ئاوەزی دەگۆڕێت، وزە و ویستەکانی نوێ دەبنەوە، بەبێ ترسی و بێزاری بەرەو مەبەستەکەی دەڕوات هەرچەندە سەختی و ئاڵنگارییەکان بەرەو ڕووی بێن.

**ئەی هاوڕێم چاو ببڕە ئەستێرەکان.. هەرگیز مەبە بەوەی هیچی نییە مادام تۆ دڵێکی بەئاگا و ویستێکی لەمێژینەت هەیە..**

سەیری خۆشەویستەکەت محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) بکە فێری بالأبوون و ویستی بەرزمان دەکات تەنانەت لە نزا و ئاواتخواستنی سەرزاریشدا، بۆیە دەڵێت: ((ئەگەر داواتان لە خوا کرد داوای فیردەوس بکەن.. چون ناوەڕاستی بەهەشتە، بەرزترینە لە بەهەشتدا، لە سەرەوەی عەرشی خوا هەیە، لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن))، تەنانەت لە داوا و نزاکەشت تەنیٚ نزای بەهەشت و پەناگرتن لە ئاگری لیٚ مەکە، بەڵکوو داوای بەرزترین و ناوازەترین پێگە و پلەی لیٚ بکە..

**خەمبار نەبیت بەوەی ڕێگەی مەزنایەتی ڕێبواری کەمە، هەر بەو جۆرەش پێشەنگەکانی ڕاستی کەمن.**

ئەو دەربڕینە تەنانەت پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) جەخت لیٚ دەکاتەوە و بە گوتەی:

((خەڵکی وەك حوشتری لاڕ و لاواز وان، خەریکە حوشترێکی بارهەڵگری بەهێزیان تێدا دەست نەکەوێت)).

بەڵیٚ ڕێژەی هەڵکەوتووانی مرۆڤ لە بەخشینیان و گەورەییان و بالأبوونیان ١٪ یا کەمتریشە..

ڕەنگە پێویست بە ڕوونکردنەوەی قسەکە نەکات جەختکردنەوە لەسەر خواست و ویست و ئاواتە بەرزەکانت بۆ بەرزەفڕی و شانازی نییە و پێویست ناکات بۆیان بە دوای نرخاندن و پاداشتدا بگەڕێیت، بەڵکوو لێگەڕێ با گەرمی دڵت هەمووان لە گشت شتێك ئاگادار بکاتەوە، لێگەڕێ بریسکەی ویستە پڕشنگدارەکەی چاوت بۆیان دووپات بکاتەوە چۆن دەبێت.

گەورە ڕاستەقینەکان هەرگیز وا نازانن بە مانەوەیان گەورە دەبن، ئەوان ڕۆڵی دیاریکراوی خۆیان لە خزمەتی پرسە گەورەکانیان دەگێڕن، داوای شکۆ و بەرزی ناکەن، بە دوای ڕووناکیی دەرکەوتن و چەپڵە ڕێزان و هەلهەلە لێدان ناگەڕێن، چاوانیان بە دوای ئامانجەکانی خۆیانەوەیە، بە دوای مەبەستە بەرزەکانەوە، بەرەو ڕووی هەنگاو دەنێن، بە کۆڵنەدانیان چیرۆکێکی تەواو دەنەخشێنن وەك ئەفسانە نەوەکان نەوە دوای نەوە بیگێڕنەوە..

نەخاسمە وەستان لە کار بۆ داواکردنی پێدا هەڵدان و چەپڵە لێدان بۆ گەورەکان پێویست نییە، خوا پلەی ئەوە بەرز بکاتەوە ئەوەی بە ئاگادارکردنەوەوە گوتی:

**((نەزانترین کەس بە ڕاستی ئەو کەسەیە داوای پاداشتی لەسەر دەکات))**

لە سەرەوەی ئەوەش نەزانترین کەس بە گەورەیی ئەو کەسەیە داوا لە ژیان بکات لە کەسایەتیی بەرز بکاتەوە و بە گەورەییەوە لەبارەیەوە بنووسێت..!.

## ٢. لەنێوان کەوتنی سەرەتا.. و ویستی سووربوون

سەرکردەی قەڵای تکریت لە عێراق پەلەی لە دانیشتووەکەی دەکرد تا لە قەڵاکە دەربچن پێش ئەوەی تەواوبوونی کاتی مۆڵەتی دیاریکراوەکەیان، سەرکردەکە پیاوێك بوو، کە لە ماوەی ژیانی ڕابردووی سەرداری قەڵاکە بوو، فەرمانی سوڵتانی پێگەیشتبوو دەستبەرداری قەڵاکە بێت و خۆی و کەسوکارەکەی بەبێ دواکەوتن جێی بهێڵن.

کاتێك ماڵباتەکە حوشترەکانیان ئامادە دەکرد و ئامادەی ڕەو بوون، ژنەکەی هاواری کرد و ژانی منداڵبوونی گەیشتبوویێ، سەرکردە سەری سووڕما چی بکات وا خەریکە خۆر گزنگ دەدات و هەڵدێت و دەستپێکردنی ڕۆژێکی نوێ لە بەرژەوەندییان نییە ئەگەر ئەوان هێشتا لەناو قەڵاکەدا بن.

پیاوەکە بەوپەڕی چاودێری و دوودڵییەوە چاوەڕێی کرد تا ژنەکەی منداڵی ببێت، لەگەڵ خۆی هەڵیان بگرێت و بیانبات بۆ شوێنی مەبەست ئەویش شاری ((بەعلەبەك))ە لە لوبنان، لە ڕێگە سەرکۆنە ژنەکەی کرد، نایەوێت هەرگیز دەموچاوی منداڵەکەی ببینێت و ناویشی لێ نانێت، کە لەو بارودۆخە ئازاراوییەی تێیدابوون ڕادەما بە

ژنەکەی گوت: گومانم وا نییە ئەم منداڵە لەم بارودۆخە سەختەدا بژیێت!.

پیاوەکە بە هاتنە دونیای ئەو ساوایە لەو شەوە دڵتەنگەدا ڕەشبینیدا، تەماشای دەموچاوی نەکرد تا گەیشتنە شوێنی مەبەست..

بەڵام قەدەر بۆچوونێکی جیاوازی هەبوو.. لەگەڵ گۆڕانی ڕۆژگاردا چاودێریکردنی بووە کارێکی تر..

ساڵان ڕۆیشتن، هەموو جیهان وەستان، بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایەوە، بە موسڵمان و مەسیحییەوە، بە ڕێز و شکۆوە، بۆ پیاوێك چەمکەکانی سەرکردایەتی و جەنگی گۆڕی.. ئەویش سەرکەوتوو سەلاحەددینی ئەیوبی بوو...

پیاوێك لە شەوێکی خەمبارانەی دڵتەنگ لەدایکبوو، چی کرد تا ببێتە ئەفسانەی دونیا و ئیلهامبەخشی سەرکردەکان و فریادەڕەسی لێقەوماوان و هێمای شکۆ و ڕێز..؟!.

کاری دونیا سەیرە و ویستی قەدەریش سەیرە..

هەموان لە شەرگەی ژیاندا دەگلێین و خاڵی دەستپێکی هەریەك لە ئێمە جیاوازە، هەریەك بە پێی بار و دۆخ و سەردەمی خۆی، ئەمیان لە ماڵی شکۆ و ڕێز لەدایك دەبێت و خاڵی دەستپێکی لە بێشکەی

ئاوریشمەوە دەست پێ دەکات، ئەویان لە کۆختەیەکی بچووک لەسەر پارچە کوتاڵێکی بێزراو لای خاوەنەکەی لەدایک دەبێت، خاڵی دەستپێکی سەخت و بەئازار دەبێت..

ڕۆژگار و ساڵان هاتن و چوون، ئەگەر یەکەمیان زۆری پێشکەش نەکرد، یا جیاوازییەکی سازاند ناوی بهێندرێت، لە کاتێکدا دووەمیان بە گیانی هەڵسانەوە و بە ویستی بزۆزەوە و بە خواست و بە توندییەوە بێ لە شل و خاوی بەرەوپێش بچێت..

ڕەنگە بەپێچەوانەوەش بێت..

**دەکرێت بپرسین.. ئایا ژیان دادپەروەر نییە، ئایا قەدەر لایەنگری کەسێك دەکات و ستەم لە کەسێکی تر دەکات؟!.**

**ئایا ئەوە دادپەروەرییە وەك یەك لەدایك نابین، پاشان لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت لەسەر ئەوەی لە کۆتاییدا گەیشتین بە کوێ، بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو جیاوازییە گەورەییەی لەنێوان دەستپێکی من و دەستپێکی جگە لە مندا هەیە؟!**

وەڵامی یەکلاکەرەوە ئەوەیە.. نەخێر.

خوا دادپەروەرە و قەدەریش بە هەمان شێوە.

خوا دادپەروەر و ڕاستە.. و لایەکانی تەرازووی قەدەر هاوسەنگن، هەرچەندە لای کەسی کەچبین وەك یەك نین..

ئەگەر خوا دەستپێکی هەمووانی وەك یەك لێ نەکردووە، ئەوا بۆ هەریەك لە ئێمە قەرەبوویەکی گونجاوی داناوە، ئەوەی هەوڵی بۆ ئەوە قەرەبووە نەدابێت ناتوانێت بیبینێت..!

**دڵتم بدەیێ قسەکەمت بۆ ڕوون دەکەمەوە..**

وەرە سەرەتا لەسەر ئەوە ڕێك بکەوین سەرکەوتن و بەرزبوونەوە لە ژیاندا خەڵات و بەخشش نییە، بەڵکوو بەری ڕەنجی دەست و ئارەقەی ناوچەوانە، ئەوەی ئەوە بزانێت بە جۆرێك کاروباری دونیای بە ڕێ دەکات لە حەوانەوەی نزیك کەم دەکاتەوە، لە بەرژەوەندیی حەوانەوەی دووری گەورە و دەیبەخشێت بە کار و ڕەنجدان، جارێك هەڵە دەکات و جارێکیش سەرکەوتوو دەبێت، لە ئەزموونەکانییەوە فێر دەبێت، لە ئێستای هەڵدەگرێت بۆ ئایندەی، لە ئەمڕۆی بۆ سبەی، ئەگەر ئەمەی کرد بە نەریت و تێکۆشان، قەرەبووی خوایی دەبینێت لەسەر شێوەی هەلی بەردەوام، لە کۆتاییی هێڵ و بەدەستهێنانی ئامانج نزیك دەبێتەوە. لە کاتێکدا ڕەنگە لە سەرەتادا دەسپێکێکەی بەشێکی زۆری حەوانەوە و سەرکەوتن بووبێت و هێشتاش نەخشەڕێگە و مەرجەکانی پێشبڕکێ بخوێنێتەوە!.

**وەرە ئەی هاوڕێم با مێژوو بخوێنینەوە..**

مووسا (سلاّوی خوای لەسەر بێت) بە شیرەخۆری فڕێ درایە ناو دەریاوە، یوســـف (سلاّوی خوای لەسەر بێت) لە بازاڕی کۆیلەکان فرۆشرا دوای ئەوەی براکانی مردنێکی ترسناکیان بۆ ئامادە کردبوو، عیسا (سلاّوی خوای لەسەر بێت) کە هاتەدونیاوە لەدایکبوونەکەی بە تۆمەت و گومان دەورە درابوو، گومانبردن لە ڕەچەڵەکی خۆی و شکۆی دایکی، محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) ژیان بە هەتیووی و سەختی ڕووبەڕووی بووەوە..

وەك ئەوەی پەیامێك بێت لە خواوە ناوی شکۆدار بێت ئەوەمان بۆ دووپات بکاتەوە دەستپێکی بە ئازار زۆربەی جار ئەگەر باش کەڵکی لێ وەربگیرێت لەوەوبەدوا ئەنجامی درەوشاوەی دەبێت

پێم وایە چیرۆکی عەنتەرەم بۆ گێراویتەوە، کە بە کۆیلەیی لەدایکبوو کەس پێیدا هەڵنەدەنا تا ڕێگەی گەورەیی و بەرزی بگرێتە بەر، دواجار بووە نموونەی ئازایەتی و پێشەنگی و جەسووری..

ئەمەت پێ دەڵێم ئەی هاوڕێی ئازام تا ئاگاداریی گیانت بیت تا نەکەوێتە داوی بەراوردی نێوان دۆخی ئەو و دۆخی ئەوەی ڕۆژگار پاڵی پێوە ناوە هەندێك دەستکەوتی زووی هەبووە، بەدڵنیاییەوە نۆرەی تۆش دێت، ڕەنگە ئەو کات لەوان دڵخۆشتر بیت هەندێك تایبەتمەندی دەست دەخەیت لەو کاتەی پێویستیت پێیەتی ئەو کات بەهای ڕاستەقینەیانت بۆ دەردەکەوێت، بە باشترین شێوە وەبەریان

دەهێنیت، بە چاکتر لە جگە لە خۆت کەڵکیان لێ وەردەگریت. چەند زۆر بوون ئەوانەی گەنجێتیان بە سەدان هەڵەوە ژیان تا ببنە کەسانی گەورە ڕەتیان کردەوە ببنە هەر شتێك.. یان هیچ شتێك.

**خاڵی دەستپێك پرسی تۆ نییە، نەنگی نییە بە هەژاری و کلۆڵی دەست پێ بکەیت، نەنگی ئەوەیە دەست پێ بکەیت و ئەو بارە بەردەوام بێت..**

نەنگی ئەوەیە بە دەستی بار و دۆخ و کارەساتەکانتەوە بناڵێنیت و خۆشت لەو هەموو کۆتە ساختانە ئازاد نەکەیت.

دەڵێم ساختە چونکە بە ڕاستی ئاوایە هەرچەندە هێز و سەختییەکەیت بۆ دەرکەوتووە. کۆلکەی هاوبەشی نێوان زۆربەی گەورەکان سەرەتایەکی ئازاراوی بە تەنگوچەڵەمەیە، پێغەمبەرانی خوا نموونەی پێشەنگین.. و بەمجۆرە.

ئەگەر گوتت منی بەندەیەکی لاواز لەکوێ و ویستی پێغەمبەرانی خوای پشتیوان بە سروش لەکوێ، وەڵامت دەدەمەوە سەرڕای نکۆڵیی داواکەت عەنتەرە بە کۆیلەیی لەدایکبوو، سەلاحەددین لە شەوێکی بێنەوا و بەدبەختی هاتە دونیا، ڕۆماننووس چارلز دیکنز*ی

---

* ڕۆماننووسێکی ئینگلیزییە، ناوی تەواوی چارلز جۆن هۆفام دیکنزە لە ١٨١٢ لە بەریتانیا لەدایکبووە و جگە لە ١٢ ڕۆمان، کۆمەڵێك کورتە چیرۆك و شانۆنامەشی بلاو کردووەتەوە، لە ١٨٧٠ هەر لە بەریتانیا کۆچی دوایی کردووە. (و)

گەورەترین نووسەری ئینگلیزی باوکی بەند کرابوو و وازی لە قوتابخانە هێنا تا بژێوی بۆ دایکی پەیدا بکات، هەموو ئەوانەی بە دەستپێکێکی ئازاربەخش دەستیان پێ کردووە، کەسیان بە پێی تەسك بینینی ئێمە جێگەی ئومێد و دەربازبوون لە ناخۆشی نەبوون.

فەرموو نموونەی ئەنشتاین**، ئەدیسۆن***، هێلین کیلەر****..

---

** زانایەکی بەناوبانگی بواری فیزیایە، لە ١٨٧٩ لە ئەڵمانیا لەدایکبووە، خاوەنی کۆمەڵێك تیۆر و دۆزینەوەی زانستییە و خەڵاتی نۆبڵی لە بواری فیزیادا بردووەتەوە، لە ١٩٥٥ لە ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە. (و)

*** داهێنەرێکی ئەمریکاییە، لە ١٨٤٧ لەدایکبووە، کۆمەڵێك داهێنانی هەیە، لەوانە: فۆتۆگراف و گڵۆپی کارەبایی..هتد و لە ١٩٣١ کۆچی دوایی کردووە. (و)

**** نووسەر و چالاکێکی ئەمریکاییە لە ١٨٨٠ لەدایکبووە، هەر لە منداڵییەوە تووشی گرفتی جەستەیی بووەوە، لەوانە لەدەستدانی توانای بینین و بیستن و ..هتد، خاوەنی ١٨ کتێبە، لە ١٩٦٨ کۆچی دوایی کردووە. (و)

***** یەکێکە لە پێشەواکانی کۆکەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر، ناوی تەواوی محەمەد کوڕی ئیسماعیلە، لە ٨١٠ لە بوخارا لەدایکبووە، ناسراوە بە پێشەوای باوەڕداران لە فەرموودەدا، لە ٨٧٠ لە سەمەرقەند کۆچی دوایی کردووە. (و)

****** زانا و بیرمەندێکی هاوچەرخی ئیسلامییە، لە ١٩١٧ لە میسڕ لەدایکبووە، زیاتر لە ٤٠ کتێبی هەیە، لە ١٩٩٦ لە سعودیە کۆچی دوایی کردووە. (و)

******* بانگەواز و تێکۆشەرێکی فەلەستینییە، لە ١٩٣٦ لە فەلەستین لەدایکبووە، بنیاتنەری گەورەترین زانکۆی ئیسلامییە و دامەزرێنەر و سەرکردەی بزووتنەوەی حەماس بوو، لە ٢٠٠٤ تیرۆر کرا. (و)

وا دادەنێم تۆ لە ڕۆڵە کەمتەرخەمەکانی نیشتمان نیت، بۆ تۆ هیچی تێ ناچێت سۆراغی سەرەتاکانی ژیانی پێشەوا بوخاری***** و شێخ محەمەد غەزالی****** و تیکۆشەر ئەحمەد یاسین******* بکەیت.

جیاوازییەکەت پێ دەڵێم ئاواتەخوازم لە ئاوەزت پانتایەك هەبێت بۆ ڕێکخستنەوە، ژیاننامەنووس و یادەوەرینووس ئەوانەن بە دوای ژیانی گەورەکاندا دەچن، لای کاری زۆر سەیری ئەو گەورانە دەوەستن، بۆیە کاتی مردنی ئەو مەزنە وا دەبێت زانراوە، بە دەگمەن ناڕوونی تێ دەکەوێت، هەرچی مێژووی لەدایکبوونە زۆربەی جار وا دەبێت یا نەزانراوە یا جێی متمانە نییە، وا دەزانم نهێنییەکەیت زانیوە..

بەڵێ..ڕۆژی لەدایکبوون ڕۆژێکی سادەی جێگەی سەرسووڕمان نییە، کەس لەبەری نەکات، پارچە گۆشتێك بە خێرایی هاتووەتە دەروازەی ژیان وەك ملیۆنان پارچە گۆشتی تر، ئەو گیانەی کە دڕی دا بە هەوای دونیا وەك گیانانی تر، لەگەڵ هەڵسووڕانی ژیان ئەو پارچە گۆشتە شێوە دەگرێت، سیماکانی کەسایەتی لێ دەردەکەوێت و ئەدگارەکانی دیاری دەکرێت، تا کاتی ماڵئاوایی دێت جیهان دەوستێت ماڵئاوایی لە گەورەکان دەکات بەرەو دوا مەنزڵگەیان، ئەم ڕۆژە خەمبارە لە یادگەی مێژوودا دەمێنێتەوە.

گرنگ نییە کەی گەورە لەدایکبووە و چۆن لەدایکبووە، گرنگ کەی مرد و چۆن مرد، بەوەش مردنی دەبێتە بانگەوازێك بەوەی زەوی بەشێك لە چاکە و جوانییەکانی لە دەست دا.

ئەگەر هاتنە دونیات بە ڕووناکی و ڕازاندنەوە دەورە نەدرابوو، وا بکە ڕۆژی ماڵئاواییت لە زەوی ڕۆژی دڵتەنگیی جیهانیان بێت و ڕۆژی شادومانیت بێت لای خودای جیهانیان.

## ٣ بخوێنە

**ئەمە یەکەمین ئەو وشانەیەی خوایە بۆ پیاوێك هەڵی بژارد تا خەڵکی لە تاریکییەوە دەریهێنێت بەرەو ڕووناکی..**

**بیرمەندی گەورە خالید محەمەد خالید* لە کتێبەکەی ((دە ڕاسپاردە))دا دەپرسێت و دەڵێت: ئەگەر وێنای ئەوەمان بکردایە ڕاسترین وشەگەلێك بکرادابایەنە دەستپێکی سروش بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ئەوا دەبوایە ئەمانە بوایە: نوێژ بکە.. خودا بپرستە.. باوەڕ بهێنە**

هەر چۆنێك بێت ئەوەی ڕووی دا پێچەوانەی گومانەکان و سەرسامکەری ئاوەزەکان بوو!!

کەواتە یەکەم پێسپاردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە خواکەیەوە پێی گەیشت بێت، ئەوا ((خوێندنەوە)) یە.. و یەکەم وشە بەسەریدا خوێندرایەوە، ئەوا: ((بخوێنە)) بوو!!

بۆیە ئەم وشە ڕێزدارە ((بخوێنە)) بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتن و شکۆمەندی و باڵابوونی مرۆڤی پەیوەست بە زانست و زانین و

---

* نووسەر و بیرمەندێکی هاوچەرخی ئیسلامییە، لە ١٩٢٠ لە شاری شەرقیەی وڵاتی میسڕ لەدایکبووە، نزیکەی ٤٠ کتێبی هەیە، لە ١٩٩٦ هەر میسڕ کۆچی دوایی کردووە. (و)

مرۆڤی بەئاگا و هۆشیار، لادانی لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کاتێك لەو خاڵەوە دوور دەکەوێتەوە.

**سەرنجڕاکێشترین شت لە کتێبدا ئەوەیە لە ناواخنیدا پوختەی مزرو گوشراوی ئەزموون و ئەوپەڕی دانایی و نهێنییەکانی مەزنیی ڕاستەقینەی لە خۆگرتووە..**

کاتێك دەستت بەرز دەبێتەوە بۆ ئەوەی کتێبێك بە دەستتەوە بگریت، ڕاستییەکەی داوا دەکەیت مەزنێك لەگەڵت دابنیشێت و لەبارەی گرنگترین و سەرنجڕاکێشترینی ئەوانەی فێری بووە و گوتوویەتی و نووسیویەتی، قسەت بۆ بکات. خوا ئەوە سەرکەوتوو بکات کە لەگەڵ گۆشەنشینەکانی دونیا دادەنیشتێت و ڕابەرایەتیان دەکات، گوێیان لێ دەگرێت و گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات، لەگەڵیان هاوڕا یا جیاڕا دەبێت، لەو گفتوگۆیە دەردەچێت و زەینی فراوان بووە و ئاگایی قوڵتر بووە و هزرەکانی دەمەزەردبوونەتەوە و ڕایەکانی ڕوونتر و هاوسەنگتر بوونە.

لەبەرئەوەی خوێنەری باش خوێنەرێکە بە مانای نەنگی، نەنگی لە وتەکانت نادۆزێتەوە، لەنێوان لاپەڕەکاندا هەرگیز بێ بیرکردنەوە لەوەی دەیخوێنێتەوە، نافرێت. هەروەها کەسێك نییە جڵەوی ئاوەزی ڕادەستی نووسەر و بیرمەندێك بکات و بەوە قەناعەت بکات و بەوە ڕازی بێت کە نووسراوە، بەڵکوو خوێنەری باش خوێنەرێکە

دادەنیشێت و ئاوەزی ئامادە دەکات بۆ ڕێکخستنی ڕایەکان و پاڵفتەکردنیان، بۆیە دەبینین ئەوەی لەگەڵ ژیانیدا دەگونجێت قبوڵی دەکات و جێبەجێی دەکات و ئەوەشی لەگەڵ ئاوەزیدا ناکۆک بوو ڕەتی دەکاتەوە، هەر شتێك لای ئاڵۆز یا سەخت بێت دەپرسێت، چونکە لە کۆتاییدا نووسەریش وەك من و تۆ مرۆڤە. ئەو کتێبە هیچ نییە جگە لە هزرێك کە خاوەنەکەی هەوڵ دەدات ڕاست و دروست بێت، جا ڕەنگە قەناعەتی پێ بکەین و بڕوامان پێی هەبێت، لەوانەشە دژ و پێچەوانەی بین.

گەورە باش دەرك بەوە دەکات ئەوە دووتوێی کتێبە بەرەو مەبەستەکەی هەڵی دەگرێت و شکاویی نەزانیی مرۆڤایەتی چاك دەکاتەوە و بنیاتی تەلاری هزری تەواو دەکات.

**گەورە ئەو کەسەیە دەخوێنێتەوە..**

**هەر چۆنێك بێت پرسیارێکی گرنگ هەیە دەبێت ئێستا بیکەم، ئەویش ئەوەیە: هەر کەسێك گلێنەی چاوی بە لاپەرەکاندا گێڕا خوێنەرێکی باشە؟**

ئایا خوێنەری باش ئەو کەسەیە کتێبخانەیەکی گەورەی سەدان و هەزاران کتێبی هەبێت و بە لە هاتن و ڕۆیشتندا بە کتێبەوە بیبینیت؟

ڕاستەکەی خوێنەری باش چەند خەسڵەتێکی گرنگی هەیە، هەوڵ دەدات دەست بە هەندێکیان بگرێت، ئەوانیش:

**یەکەم: خۆبەکەمزانینی هزری:**

خۆبەکەمزانین لە خۆبەگەورەزانین و خۆهەڵنان بەسەر زانست و زانیندا دووری دەخاتەوە.. گەورە باش دەرك بەوە دەكات دانایی تەنیا لە خاکی ئەو ئاوەزەدا نەبێت چووزەرە ناکات، کە بە خاکەناسی خاکیبوون کێڵرابێت، پاشان تۆوەکەی تێدا ڕەگ دادەکوتێت و بە گەرمی لە لایەن ئاوەزەوە قبووڵ دەکرێت و بە بەرە شیرین و گەشاوەکەی لە هزر و بۆچوونە بەهادار و مەزنەکاندا دەشنێتەوە.

کاتێك خوێنەری ئێمە هەستی بە پڕی پاشخانی هزری و ڕۆشنبیری و پێویست نەبوونی بە خوێندنەوە کرد، ڕاستییەکەی ئەوە لە لێواری کەوتن و هەڵدێراندایە.

**دووەم: توانای شیکردنەوە و ئەنجامگیری:**

یەکێك لە خراپییەکان ئەوەیە ئەوەی خوێندوومانەتە قبووڵی دەکەین بێ ئەوەی بە ئاوەز کاری پێ بکەین، بۆ نموونە ئەگەر بۆچوونێك یان هزرێکت خوێندەوە، پێویستە لەسەری ڕابوەستیت بۆ شیکردنەوەی، ئەم شیکردنەوەیەش بە گوشێنەری ئەو ئەزموونانەی

پێشوو دەبێت، کە بە خوێندنەوە بەدەستمان هێناوە، یاخود لە ئەزموونەکانی ژیانی دەوروبەرمانەوە وەرمان گرتووە.

مەکەوە ژێر کاریگەریی جادووی دەربڕینی نووسەر، ناوی هەر چی بێت، پێگەکەی بپارێزە، کە بە ماندووبوون و کۆشش پێی گەیشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا واز لە زەینت بێنە وەردەگرێت و فەرامۆشیش دەکات، قبووڵ دەکات و ڕەتیش دەکاتەوە.

**سێیەم: خوێندنەوەی ڕێکخراو:**

ئەوەی، کە هەموو کاغەزێك بەرچاوی دەکەوێت دەیخوێتەوە خوێنەرێکی باش نییە، بەڵکوو کەسێکە بە شێوەیەکی ڕێکخراوی ڕێکوپێك دەخوێنێتەوە. مەبەست لە ڕێکخستن دابەشکردنی خوێندنەوەکەتە بەسەر تەواوی بایەخپێدانەکانت و پسپۆڕییەکەت. پانتایەکی فراوان لە خوێندنەوەکەت ببەخشە بەو بوارەی پسپۆڕیت تێیدا هەیە، پانتاییی کەمتر بۆ شتی کەمتر، بۆ نموونەی ئەگەر تۆ بانگخوازێك بیت پێویستە بەشێکی زۆر لە خوێندنەوەکەت بۆ کتێبەکانی فیقە و بانگخوازی و تەفسیر تەرخان بکەیت پاشان بۆ کتێبەکانی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵناسی بە پلەیەکی خوارتر تەرخان بکەیت. پێویستە لەسەرت کۆششی خۆت لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بخەیتە گەڕ کە هەژماری ئەزموون و ئاگاییت لە بواری کار و پسپۆڕییەکەت زیاد دەکەن، پاشان بەرەو زانستەکانی تر بڕۆ،

ئەوەیان لێ بخوێنەوە کە دەبێتە هەژمارێکی باش بۆت وا دەکات لە پەیوەندی و پێکەوەیی بیت لەگەڵ خاوەنانی بوارەکانی تردا. بەمجۆرە تێگەیشتن بۆ ژیان بە فراوانبوونی لایەن و چالاکییەکانی زیاد دەکات. خوێندنەوەی ڕێکخراو شتێکی گرنگی لێت دەوێت ئەویش هەبوونی ئامانجە لە خوێندنەوە، ئەگەر ئامانجت بەرزبوونەوە و جیاوازبوون و گەورەییە، ئەوا خۆت هان بەدەیت بۆ ڕێکخستنی خوێندنەوەت بەو شێوەیەی پێشتر گوتمان. ئەگەر لە خوێندنەوە ئامانجت نەبوو و تەنیا بۆ بەسەربردنی کات بوو، ئەوا تەنیا بۆ چێژ دەخوێنیتەوە بە چاوپۆشین لەو سوودەی لێی چاوەڕێ دەکرێت.

## چوارەم: خوێندنەوە ڕەفتارە:

خوێنەری باش کەسێکە خوێندنەوە دەکاتە ڕەفتاری ژیانی، ئەمە بێجگە لەوەی ئەرکی خوێندنەوەی هەیە هەوڵ بۆ تەواوکردنی دەدات، هەرچەندە ئەو خولەکانەی بۆ خوێندنەوە تەرخانی دەکات کەم بێت، بەڵام ئەو پێوەی پابەند دەبێت و بە شێوەیەکی نموونەیی بەکاری دەهێنێت. ئەمە هانم دەدات بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەزموونێکی سەرنجڕاکێش و بەرهەمدار ئەویش بەکارهێنانی زیرەکانەی تۆیە بۆ کاتە لەدەستچووەکانت و مەبەستم لێی ئەو کاتانەیە کە بەسەریان دەبەیت لە چاوەڕوانیکردنی پزیشک یاخود لە هۆیەکانی گواستنەوە، دەکرێت هاوڕێیەتی کتێبێکی بچووکی گیرفان

بکەیت و ئە وکاتانەی پێی بەسەربەریت کە زۆربەی جار بێ وەربەرهێنانێکی باش بەفیڕۆ دەڕوات.

## پێنجەم: تەرکیز خستنە سەر چۆنیەتی نەك چەندێتی:

خوێنەری باش شانازی بە زۆری ئەوەی خوێندوویەتییەوە ناکات، بەڵکوو شانازی بەو ڕادەیەوە دەکات کە هەوڵی داوە تێ بگات لەوەی خوێندوویەتییەوە و بە بیرۆکەیەکەوە یاخود تێڕوانینێکی تایبەتەوە لێی دەرچێت. نووسەر ((عەباس مەحموود عەقاد))* لەمبارەیەوە گوتەیەکی سەرنجڕاکێشی هەیە، کە دەڵێت: **((ئەگەر سێجار کتێبێکی باش بخوێنیتەوە باشترە بۆت لە یەکجار خوێندنەوەی سێ کتێبی باش)).**

سوودەکەی ئەوەیە تۆ بە دووپاتکردنەوە دەتوانیت باوەش بە هزرەکەدا بکەیت و بچیتە قوڵاییی زەینی نووسەرەوە. جگە لەوەی لێرەدا ئاگادارکردنەوەیەك هەیە لەسەر شتێکی گرنگ ئەویش ئەوەیە کتێبە لاپەڕە کەمەکان پێویست ناکات کاتێکی زۆری بۆ تەرخان بکەیت وەك ڕۆمانەکان و کتێبی ڕۆشنبیریی گشتی و ڕۆژنامە و ئەوانی تر. لە کاتێکدا کتێبی هزری و زانستی قووڵبوونەوە و

---

* نووسەر و شاعیر و بیرمەند و ڕۆژنامەنووسێکی میسرییە، لە ١٨٨٩ لە شاری "ئەسوان"ی ئەو وڵاتە لەدایکبووە، کۆمەڵێکی زۆر کتێبی هەیە، لە ١٩٦٤ لە شاری قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. (و)

تەرکیزت لەسەر پێویست دەکات. لێرەدا من باس لە پێویستی چوونە قووڵاییی هزرەکە دەکەم، ئەگەر تۆ دەتوانیت بە خێرایی بخوێنیتەوە و بە خێرایی تیٚ بگەیت ئەوا زۆرباشە، ئەگەر توانای ئەو دووەت نییە، ئەوا بایەخی زۆر ژمارە مەدە و تەرکیز بخە سەر مانا و چەمك و قووڵبوونەوە.

**شەشەم: خوێنەری باش کەسێکە لەبارەی ئەوەوە قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات کە خوێندوویەتییەوە:**

ئەزموون سەلماندوویەتی لەو کاتەی ئەوەی خوێندووتەوە یان خوێندووتە شرۆڤەی دەکەیت و قسەی لەبارەوە دەکەیت ئاگایی و تێگەیشتن و دەرککردنت بە شێوەیەکی زۆر زیاد دەکات، کاتێك هزرەکە لە سەرت دەردەچێت دەبێتە نامەیەك لەسەر زارت و گویٚ و ئاوەزی ئەوی تر (کە گوێگرە) پێشوازی لیٚ دەکەن، کە ڕەنگە هاوڕات بێت و زیاتر بۆت ڕوون بکاتەوە، یان پێچەوانەی تۆ بێت و گۆشەیەکی تری هزرەکەت بۆ ڕوون بکاتەوە تۆ ئاگات لێی نەبووە. لە کۆتاییدا دەبینیت قسەکردنت لەبارەی ئەوەی خوێندووتەوە زانیارییەکان بە شێوەیەکی باش لە زەینتدا ڕێك دەخات و لە چوارچێوەیەکی ڕێکخراودا دایان دەنێت، ئامادەیان دەکات بۆت بۆ هێنانەوەیان بە شێوەیەکی ئاسان تا لە ژیانتدا سوودیان لیٚ وەربگریت.

ئەو کەسەی ویستی مەزنبوونی هەیە چاوی لەوەیە ببێتە خوێنەرێکی باش، ئەمەش نایەتە دی تەنیا دوای ئەوە نەبێت جەخت لەوە بکاتەوە بەرپرسیاریەتیی سەرشانیەتی بیر لەو وشە نووسراوانەی بەردەمی بکاتەوە و بێ قبوولکردن خۆی ڕادەستی ئەو بیرانە نەکات کە خراونەتە ڕوو، بەڵکوو لەسەری پێویستە زەینی بە ئاگا بهێنێتەوە، هەردەم بپرسێت و تێبینی ئەوە بکات کە دەیخوێنێتەوە.

درەوشانەوە

خوێنەری خراپ دوو جۆرە: جۆرێکیان بێ ڕامان دەخوێنێتەوە و ئەوەی بۆی دەگوترێت قبووڵی دەکات و بەتەواوی خۆی ڕادەستی دەکات، جۆرەکەی تر بۆ ئەوە دەخوێنێتەوە هەڵە و تێکەوتن و نەپێکان لە نووسەر بگرێت، خۆپەرستی بە زیرەکیی خۆیەوە دەکات و شانازی بە تواناییەوە دەکات لە ڕاوکردنی هەڵەکاندا.

## ٤ خۆشەویستی پرسێکی گەورەیە

بە تێڕوانینێکی قووڵ دەتوانین جەخت لەوە بکەینەوە هیچ مرۆڤێکی گەورە و بالاَ و سەرکردە نییە، لە ناخیدا خۆشەویستییەکی بێ سنووری بۆ مرۆڤایەتی نەبێت و هانی نەدات بۆ بەدەمەوەچوونی و شەونخونیکردن لە بیرکردنەوە بۆ چۆنیەتی ڕزگارکردنی.

خۆشەویستی ناکرێت لە دەروونێکەوە هەڵبقوڵێت خۆی خۆش نەوێت و پێزانینی بۆ خۆی نەبێت و بڕوای بە بالاَیی ئەوە نەبێت هەڵی گرتووە..

بەڵێ خۆشەویستی لە ناخێکەوە هەڵدەقوڵێت خۆی خۆش دەوێت!

سەیر نییە، چونکە ئەوەی خۆی خۆش دەوێت خۆشەویستییەکە لە پێزانینی خودییەوە سەرچاوە دەگرێت و ئاماژەیەکی بەهێزە بەوەی ئافرێندراوی خوای مەزنە، بۆ ئامانجێکی گرنگ و گەورە هاتووە.

پێشینان گوتوویانە: ئەوەی هیچی نەبێت هیچ نابەخشێت..

کەوابێت پێش ئەوەی دەست بکەین بە بەخشینەوەی چەپکە گوڵی خۆشەویستی و چاکە بەسەر خەڵکیدا، با دڵمان پڕ بکەین لە خۆشەویستی و چاکە..

بەرامەی یەکەمی ئەم خۆشەویستییە پێویستە خودی بێت، پێویستە بە ئاراستەی گیان و ناخت بێت..

ئایا ئەرشیفێك لە تاوانت و تۆمارێکی پڕ لە هەڵەت و مێژوویەکی بەئازار لە شکستت هەیە؟

گوێ مەدەیە.. ئەی کەواتە بۆچی خوا لێخۆشبوون و تۆبەی داناوە؟؟

بڕوام پێ بکە هەموو ئەمانە نابنە کۆسپی ڕێگەی دۆزینەوەی گەورەییت و شیاندنی بەهرە و تواناکانت تا لە خزمەتی چاکە بەکاریان بهێنیت..

بڕوام پێ بکە..

تۆ ئەی هاوڕێم کەسێکی جوانی.. کەسێکی سەرنجڕاکێشی.. کەسێکی باش و گەورەی.

سەرەڕای هەڵە و تێکەوتن و هەڵخلیسکانت..لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی چاکەیەی لە ناختدایە هەمیشە لە کەوتنتدا هەڵتدەستێنێتەوە لەبەرئەوەی کەسی سەرنجڕاکێش و گەورە سەردەکەوێت.

وەك ئەوەی پێم دەڵێیت: بەڵام ڕابردووی بەئازارم دووری خستوومەتەوە و هەڵەکانم ڕوانینی بەردەم چاوی لێڵ کردووم، شەیتانانی مرۆڤ و جنۆکە زەویی ژێر پێم ڕادەکێشن و

وەڵامت دەدەمەوە بە گوتەی: بەڵام!

هەرچەندە هێزە خراپەکانی دەورت هەوڵ بدەن کۆسپ بخەنە سەر ڕێگەی گەیشتنت بەو شوێنە، بەڵام تۆ بەو هەژمارە چاکەیەی لە ناختدایە ئاگاداریان دەکەیتەوە، بە داوای لێخۆشبوونی بەردەوام ئاگاداریان دەکەیتەوە، بە پەشیمانبوونەوەی هەردەمت ئاگاداریان دەکەیتەوە و بە مەیلت بۆ نزیکبوونەوە لە خوا، هەرچەندە بۆ ماوەیەك یان چەند ماوەیەك لێی دوور کەوتبێتییەوە..

ئەو دەستە پڕ سۆزەی کە هەستی خۆشەویستیی دەیجوڵێنێت بەسەر خۆتی دوودڵدا بهێنە، متمانەت بە خۆت هەبێت، متمانەت بەو کۆگە خۆشەویستی و چاکەیەی هەبێت، کە لە ناختدایە..

کۆگەی دڵت پڕ لە متمانە و خۆشەویستی و ئومێد بکە.. ئەمە هەنگاوی یەکەمە..

تێڕوانینت بۆ ژیننامەی گەوران ڕاست بکەوە.. دەبینیت تیشکی گەورەییان تەنیا لە گیانێکی پڕ لە هێز و ئومێد و خۆشەویستی و چاکبوون لەگەڵ خود و پێزانینی تەواو بۆ خود دەرچووە، بەپێچەوانەوە هیچ ستەمکار و شەڕانگێزێك نییە پانتایەك تاریکی لە ناخیدا نەبێت و وێرانییەك کە بە دڵی وێنا ناکرێت. گەورەییخوازیشی بە گومانەوەیە لە زۆرینەی جاردا دەبێت فەرامۆشی و گاڵتەپێکردنی خود.

**ئەی هاوڕێم بە خۆشەویستی ڕووبەڕووی هاوبەشەکانمان دەبینەوە و هەر بەویش بەرەنگاریی ڕکابەرەکانمان دەبینەوە!**

**هاوەڵانی پێغەمبەر لە ڕۆژێکدا کە بە دەستی زۆردارانی هێزی خراپەوە ئازاریان دەچەشت وەستان و پاشان بە پێغەمبەرەکەیان** (درودی خودای لەسەر بێت) **گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! نزا لە هاوبەشدانەرەکان ناکەیت؟ پێغەمبەر پێی گوتن: من بۆ نەفرەت نەنێردراوم، بەڵکوو من بۆ سۆز و میهرەبانی ڕەوانە کراوم.** ((موسلیم گێڕاویەتییەوە))

میهرەبانی لە دڵێکەوە هەڵدەقوڵێت.. خۆشەویستی دەکات، هاوڕێیەتی دەکات، بیانوو بۆ بەرانبەر دەهێنێتەوە، چاوپۆشی دەکات، دەبوورێت.

**حەز دەکەیت گەورە بیت ئەی هاوڕێم؟ لەسەرتە هەندێك باجی گەورەیی بدەیت، یەکەمیان ئەوەیە ویستی چاکە و خۆشەویستی لە ناختدا بەهێزتر و گەورەتر بێت لە ویستی خراپە لە دەروونی کەسانی تر..**

ئەو کەسەت خۆش بوێت، کە خەڵکی وازیان لە خۆشەویستیی ئەو هێناوە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ.. مرۆڤی..

بەزەییت بە سەرپێچیکارە گوناهبارەکاندا بێتەوە..

بەزەییت بە ئەوانە بێتەوە بە کەوتنە ناو زۆنگاوی بەدڕەفتاری و نالەباری و خراپە پیس بوون..

خەمی لابردنی تۆزی سەر ئەو دلآنە هەڵبگرە، کە ژیان بەسەریاندا باراندوونی، تا گەوهەری شاراوەی ناخی مرۆڤە دەربکەوێت، کە کەس وێنای ئەوە نەدەکرد هێشتا چاکەی پێوە مابێت.

شتێکی گەورە نییە ئەوەت خۆش بوێت، کە خۆشی دەوێیت، ڕێزی ئەوە بگریت، کە ڕێزت دەگرێت. لەگەڵ ئەوانە دابنیشیت کە قوتابخانە پێی گەیاندوون و باوانیان پەروەردەی کردوون و ڕۆژگار بە باشترین بار ئامادەی کردوون!

ڕاستییەکەی شتێکی مەزنە دابەزیتە سەر زەوییەکی نارێکی پڕ پاشماوە و قۆڵی لێ هەڵبماڵیت و بە متمانەبەخۆبوونەوە هەنگاوەکان بهاوێژیت بۆ ڕزگارکردنی ئەم و ئەو، کە کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە.

**ڕاستییەکەی ئەوەیە گەورە دەزانێت چۆن خۆشەویستی دەکات.. بێ بەرانبەر.**

**چۆن دەبەخشێت بێ چاوەڕێکردنی پاداشت..**

**چلۆن کتێبی ژیان دەخوێنێتەوە، کە قورسترین بەشی هەڵدەبژێرێت و پشت بە خوای خۆی دەبەستێت و باش قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و**

زەینی بە ئاگا دەهێنێتەوە و ویستی تاو دەسێنێت بۆ کردنەوەی جاسوەکەی و خوێندنەوەی بۆ خەڵکی..

## ٥. سەرەتا باوەڕت بە پرسەکەت هەبێت

**پێشتر پێم گوتی و وا دووبارەی دەکەمەوە: دەبێت باوەڕمان بە پرسێکی گەورە هەبێت تا ببینە کەسانی گەورە.**

دەبێت پڕۆژەیەکمان هەبێت کاری بۆ بکەین، هزرێکی بالآمان هەبێت لە پێناویدا قوربانی بدەین، مەبەستێکی مەزن هەنگاوی بۆ بنێین..

پێویست ناکات گوریسی منێتی و خودخۆشەویستیمان لێ هەڵبوەشێننەوە، بۆ خۆمان دەژین و بەمجۆرە..

ڕاستییەکەی بۆ ئەوەی گەورە بین پێویستە ئەو پرسە گەورانە سەربخەین، کە پەیوەندیی بە خەڵکییەوە هەیە و مرۆڤایەتی پێی بەرز دەبێتەوە.

حەز دەکەم بەڕاشکاوی ئەوەت بۆ دووپات بکەمەوە باوەڕت بەو پرسە گەورەیە، دەبێت لە تەنیا ((بایەخ پێدانت پێی)) تێبپەڕێت!.

فەیلەسووفی ئینگلیزی ((جۆن ستیوارت))* دەڵێت: **تاکە کەسێك باوەڕی بە شتێك هەبێت لە هێزدا زاڵ دەبێت بەسەر ٩٩ کەس کە تەنیا بایەخی پێ دەدەن.**

---

* فەیلەسووف و ئابووریزانێکی ئینگلیزییە، ناوی تەواو "جۆن ستیوارت میل"ە، لە ١٨٠٦ لە شاری لەندەن لەدایکبووە، چەند کتێبێکی هەیە، لە ١٨٧٣ لە فەرەنسا کۆچی دوایی کردووە. (و)

لێرەدا شتێك هەیە وەك ناوچەی خۆڵەمێشی وایە ناکرێت بە ڕوونی جیای بکەیتەوە و تۆ وا خۆت دادەنێیت باوەڕت بە پرسەکە هەیە تەنیا بۆ ئەوەی تۆ بە گرنگیپێدەر دابنرێیت!

بەرگری دەکەیت و مشتومڕ دەکەی و گفتۆگۆ دەکەیت.. بەڵام خۆت دەشاریتەوە کاتێك دەگاتە ساتی دیاریکردن.. ساتێکە سامان بەرگری لێ ناگات یان گفتوگۆی لەبارەوە بکات یاخود مشتومڕی لەسەر بکات..

کاتێك سەردانکەرانی شەو* دێن یان دەکەویتە بەر تیری ڕەخنە، ڕەنگە خۆت بشاریتەوە، هێرش بکرێتە سەر پێنووسەکەت و جووڵەت نەمێنێت و دەنگت نزم بکەیتەوە.. تۆ باوەڕت بە پرسەکەت نییە، سەرەڕای جەختکردنەوەی بەردەوامت بەوەی پرسی تۆیە.

**هەموو بانگەشەی گەیشتن بە لەیلا دەکەن**

**لەیلاش هیی کەسیان بە ڕاست دانانێت**

**باشە تۆ گرنگی پێ دەدەیت.. بەڵام دەبێت بانگەشەی باوەڕپێبوون بکەیت..**

---

* ئەم دەربڕینە بووەتە زاراوە، لە بنەڕەتدا مەبەست لەو کەسانە بوو، کە سەرکردە ئایینییەکانیان بە ئامانج دەگرت لە ماوەی دەسەڵاتی حیزبی سۆشیالیستی لە حەفتا و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە باشووری یەمەن. (و)

**ئەی هاوڕێم ئەمەش لەبەرئەوەی جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە..**

یەکێك لە باشییەکان ئەوەیە تۆ تاکێك بیت لە سوپای چاکسازیدا، بە تۆوە ژمارەیان زۆر بێت، گەورەییان پێ دەبەخشیت لە جەختکردنەوە لە هێز و هەبوون و سەرەتای چوست و چالاکی، ئەمەش بە گواستنەوەی هزرەکان و ڕەواج پێدانیان و بڵاوکردنەوەیان دەبێت، هەروەها چوونە ناو گفتوگۆوە لەبارەی گرنگی و گەورەییەوە، بەڵام هەموو ئەمە سەرەڕای گرنگییەکەی ناگاتە پلەی باوەڕهێنانی ڕەها، کە پێگەیەکی بەرزە لە تایبەتکردنی هەموو شتێکی گرنگ و گەورە و زیندوو لەپێناوی هزرەکەی.

چ بلیمەتییەك لە وەڵامی دایکمان ((عائیشە)) ڕەزای خوای لەسەر بێت دەردەکەوێت، کە وەسفی هاوسەرەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات بەوەی ((قورئانێك بوو لەنێو خەڵکیدا دەڕۆیشت)). بە ڕوونی دەڵێت محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) هزرێك بوو، داڕشتەیەکی ڕاستەقینە بوو بۆ هەموو ئەوانەی بانگەشەی بۆ دەکردن.

هەروەك جێی سەرسوورمانە خاوەنی (الظلال)** ئەم بارە بەم گوتەیە دەردەبڕێت: ((**سەرەتا تۆ باوەڕت بە هزرەکەت هەبێت، تا ئەوپەڕی بڕواپێکردنی ڕاست باوەڕت پێی هەبێت، لە کاتێکدا ئەوانی تر تەنیا باوەڕیان پێیەتی**))، ئەوەشی دەخاتە سەر و دەڵێت: ((**هەموو هزرێك لە دڵەوە خۆراکی پێ بدرێت دەژییێت! هەرچی ئەو هزرانەی لەو خۆراکە پیرۆزە ناخۆن بە مردوویی لەدایك دەبن و مرۆڤایەتی یەك بست نابەنە پێشەوە**))!

هەروەها تیۆردارێژەری گەورەی ڕابوون ((مالیکی کوڕی نەبی)) بۆمان دووپات دەکاتەوە گەورەی خاوەن پرس دەبێت خاوەنی دوو کۆڵەگەی گرنگ بێت ئەوانیش: ((قەناعەت پێبوون و قەناعەت پێکردن: قەناعەت پێبوون واتە تا ئەوپەڕی قەناعەت قەناعەتی بە هزرەکە هەبێت.

هەرچی قەناعەت پێکردنە ئەوە هەوڵدانە بۆ قەناعەت پێکردنی ئەوانی تر بەو قەناعەتەی بۆ هزرەکە هەتە بەو شێوەیەی دەکرێت ڕۆڵی ژیاری خۆی بگێڕێت)).

---

**مەبەست لێی کتێبی (في الظلال القران)ی سەید قوتبە (١٩٠٦ ١٩٦٦)، کە تەفسیری قورئانە و لە ٥ بەرگ پێکهاتووە.

† نووسەر و بیرمەندێکی ئیسلامییە و لە ١٩٠٥ لە جەزائیر لەدایکبووە، زیاتر لە ٢٠ کتێبی هەیە، لە ١٩٧٣ هەر لە جەزائیر کۆچی دوایی کردووە. (و)

هزرە مەزنەکان تینی گەرمییان هەیە پێویستە بگاتە ئەوی تر، پێویستە لە قسە و گوفتار و ڕەفتارت هەست بە گەرمییەکەی بکرێت پێش ئەوەی.. بڕوات پێ بکرێت!

ڕەنگە هاوڕێیەك بپرسێت: چ هزرگەلێکی مەزن پێویستە بنیاتیان بنێم و بیگوازمەوە بۆ خەڵکی؟

دووبارەی دەکەمەوە، ئەوەی دەتوانیت لە چاکە ئەی هاوڕێم.

**هزرە مەزنەکان زیاتر هانت دەدەن، چونکە هەر یەکێکیان ببینیت خۆیەتـی، دادپەروەری هزرێکی گەورەیە، ئازادی هزرێکی مەزنە، بڵاوکردنەوەی هیوا و گەشبینی لە دەروونە تێکشکاوەکاندا هزرێکی مەزنە.**

لای تۆش هەیە.. هەژاران و ئازارەکانیان، ستەملێکراوان و ئارامگرییان، شارستانی و چۆنیەتیی بنیاتنانی، سەرچاوە مرۆییەکان و ڕێگەکانی پەرەپێدانی.. ڕەنگە ژیانت تەرخان بکەیت بۆ دەست خستنە سەر شانی هەژاران و سووککردنی باری ژیانیان. هەر پرسێکی مرۆڤایەتی مەبەستێکی ڕێزدارە لە خودی خۆیدا. ئەمە پاڵم پێوە دەنێت بۆ ئاگادارکردنەوەیەك سەبارەت بە چەمکێکی تری زۆر گرنگ ئەویش جیاوازیی ئایدۆلۆژیا و حەزەکانە، نابێت ڕێگریمان لێ بکەن دەستمان نەخەینە ناو دەستی یەك بۆ بەشداریکردن لە

گەیشتن بە ئامانجێکی ڕێزدار و بەرز، تەنانەت ئەگەر بیروباوەڕ و نەوەتەکانیشمان جیا بوون.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم چەمکە بە فەرموودەیەك دەچەسپێنێت، کە سنوورەکانی بلیمەتی تێدەپەڕێنێت، دەگێڕێتەوە چۆن ئەوەی بینیوە هەرچەندە بە تەمەن بچووکیش بووە، بەڵام ڕووداوێکی ناوازە بووە، ئەویش پێکهێنانی هاوپەیمانییەك بووە ئامانجی سەرەکی ڕەتدانەوەی ستەم و گەڕاندنەوەی ماف و وەستانەوە بە ڕووی ستەمکاران بوو، بۆیە دەڵێت: **((لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان پەیمانێکم بینی، ئەگەر لە ئیسلامدا بانگی بۆ بکرایە بەدەمیەوە دەچووم))**، ئەوەی جێگەی سەرسامییە لێدوانی دواییی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە هیچ نەنگی و ناتەواوییەکی نەبینی بۆ چوونە ناو هەر هاوپەیمانییەك لە باریدابێت بەهایەکی شکۆمەندانە بەرز بکاتەوە، ئەمە بنچینەیەکە لە بنچینەکانی بانگەوازەکەی، بە چاوپۆشی لەوەی کێ دەستپێشخەری دەکات و کێ بانگەشەی بۆ دەکات، گرنگ ئەوەیە بەهای هزرەکە و هێزەکەی و گەورەییەکەی .. و بەرزییەکەیەتی.

**دەگەڕێمەوە بۆ قسەکەم لەبارەی باوەڕت بە هزرەکە و دەڵێمەوە باوەڕت بە هزرە بەرزەکە چەند خاڵێکی گرنگت بۆ دەڕەخسێنێت، ئەوانیش:**

یەکەم: سووربوون (پێداگری)، هەرگیز ناکرێت لەسەر پرسێك سوور بیت، کە باوەڕت پێی نەبێت، ناکرێت وشەکانت گەرموگوڕ بن و گیانت لێبوردە و دڵت پڕ لە وزە بێت ئەگەر پاڵنەرەکانت مەزن نەبن. پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوەندە سووربوونی هەبوو لەسەر کارەکان هەموو سنوورەکانی تێپەڕاندبوو، تەنانەت خوا ناوی شکۆدار بێت بە ئاسانکراوەی لەبارەیەوە فەرموویەتی:

جا لەوانەیە لە خەم و پەژارەدا لە سەرئەنجامی ڕەشی ئەوانەی باوەڕ بەم فەرموودەیە ناهێنن خۆت لەناوبەریت و لە داخ و خەفەتدا بمریت

مانای وشەی (خۆلەناوبەر لە داخ و خەفەتدا) ئەوەیە: کۆششکردنت بۆ بانگگردنی نەتەوەکەت کۆششێکی خۆلەناوبەرە، ئەمەش نیشاندانی هێواشکەرەوە و ئاسانکەرەوەیە لە لایەن خوامانەوە بۆ پێغەمبەرەکەی.

**باوەڕهێنان بە هزرەکە سووربوون لە بانگەشەکردن بۆی و خستنەڕووی و دەستخستنی جۆرێك لە ژیان و جووڵە دێنێتە کایەوە.**

**دووەم: باوەڕهێنان بە هزرەکە هانت دەدات بۆ شارەزابوون لێی و** هەوڵدان بۆ زانینی خاڵە بەهێزەکانی و ناسینی ئەو ڕەخنانەی

ئاراستەی دەکرێن. باوەڕهێنانت بە شتێك پاڵت پێوە دەنێت بۆ بەدەنگهاتن لەسەری و پاشان بەرگریکردن لێی، ئەمەش نایەتە دی تەنیا بە زانینی ئەو لایەنە جیاوازانە نەبێت، کە باوەڕی پێیەتی و چووەتە نێو وردەکارییەکانی و گەڕان بە دوای ئەوانەی بەهێزی دەکەن و چۆنیەتیی وەڵامدانەوەی ئەوەی هێرشی دەکاتە سەر، ئەمەش پاڵت پێوە دەنێت، چونکە دەخوێنیتەوە و تێدەگەیت و دەگەڕێیت و دەپرسیت.

**باوەڕ تەواو نابێت تەنیا بە زانست نەبێت. سۆز و میهرەبانی خودا لەو پیاوە کاتێك شوێنکەوتووانی پێدەگەیاند تێگەیشتنی خستە پێش دڵسۆزییەوە و ئاوەزی کردە چرای پێشڕەوی دڵی دڵسۆز.. و بەمەش هزرەکان دەژین.**

**سێیەم: خۆڕاگری..** گرنگترین شت لێرەدا هێز و خۆڕاگریتە بەرانبەر ئەو ئاستەنگانەی بێگومان ڕووبەڕووت دەبنەوە و هەوڵ دەدەن زەفەر بە خۆت و هزرەکەت بەرن، هەرچەندە هزرەکەت باڵا بێت دەبینیت بێ بەهای دەکەن و هەوڵ دەدەن بە درۆی بخەنەوە و خەڵکی لێ بترسێنن. ئەوەی گومان لە نیازەکانت دەکات و تۆمەت بۆ ویژدانت هەڵدەبەستێت و هەموو ڕەفتارەکانت دەخاتە ڕوو بەوەی کە لە مەبەستێکی ترەوە سەرچاوە دەگرێت بەپێچەوانەی ئەوەی دەردەکەوێت، ناتوانیت بەرانبەر هەموو ئەمانە خۆڕاگر بیت جگە لە هێزی باوەڕبوونت بە هزرەکە، ئەوکات هەست دەکەیت هەموو

ئەوەی ڕووبەڕووت دەبێتەوە لە بەلاّ و ئازاردان ئەو باجەیە دەیدەیت لە پێناوی ئەوەی ببیتە مرۆڤێکی مەزن، ڕاستیی هزرەکەت لەسەرت پێویست دەکات لە پێناویدا بەرگەی شتێکی زۆر بگریت.

**چوارەم: هیوا..** هەمیشە باوەڕ هاوەڵی هیوا و گەشبینییە، ئەوەی گومانی لە سەرکەوتنی پرسەکەی هەیە سەرەتا پێویستە باوەڕی پێی بەهێز بکات، بە ڕوانین لە خاوەنانی پەیامە بەرزەکان دەبینین ئەوان لە تاریکترین کات و لە توندترین و سەخترین تاقیکردنەوەدا بێگومانییان* بە قەد سەرەپەنجەیەك بە سەرکەوتن لەق نەبووە، بە پێچەوانەوە ئەوان ئومێدیان بەسەر کەسانی تر بلاّو دەکردەوە، ئەوان چاوەکان پێیانەوە پەیوەستن و ناخەکان بە بینینیان گیرۆدەن و دڵەکان بە بیستنی دەنگیان دڵنیا دەبن.

---

* بێگومانی: یەقین (و)

## ٦. چاودێریی بەشی دەروونت بکە

**بەڵای بەڵایان بۆ خاوەن پرسە مەزنەکان ئەوەیە ئارەزووی دەروون بچێتە دڵیانەوە، ئەوەش کە پاکیی نیازە تێکەڵ بە تۆزی ((من)) بێت.**

شتێك کە پێویستی بە پێداچوونەوەی خێرا هەیە ئەویش زاڵبوونی بەشی دەروونتە بەسەر بەشی پڕۆژە یان هزرەکە، دەبێت وشە مەزنەکانمان لە خزمەت مەبەستی بچووك یان ئامانجێکی شاراوەدا بن، یا تینوێتییەکی کەم تێراو بکەن.

سەرکەوتنی ئەو پرسەی هەڵمان گرتووە کۆششێکی زۆری گەرەکە ناڵێم لە زاڵبوونی بەشی ئەو بەهایانەیە کە بانگەشەی بۆ دەکەین بەسەر بەشی دەروونەدا، بەڵکوو لە چاودێریکردنی دەروون و زانینی کاتی گونجاو بۆ گەڕاندنەوەی بۆ ناوچەی سادەبوونەوەی تەواوەتی، لەبەرئەوەی ئارەزووەکانمان ناپاکن، دەمانتاسێنن و ناوچەیەکی زۆر لە گیانمان داگیر دەکەن و دەست بە فەرماندان دەکەن و زۆربەی جار پۆشاکی ئاڵووالآی بریسکەدار لەبەر دەکەن.

لەبەرئەوە کاتێك سەیری دواوە دەکەین دەبینین زۆرێك لە بانگەشە مەزنەکان کەسێکی داهێنەر ڕابەرایەتی کردووە، هەمیشە توانای هەبووە هزرەکە سەر بخات و ئاوێتەیەك ساز بکات بە مانای تاکێتی و هێزەکەی و بە گەورەییی هزرەکە گەورە دەبێت و بەشی دەروونی

لە دەست دەچێت و کۆتایی پێدێت. ئەو گەورانە لەگەڵ گەورەییاندا هەرچەندە ڕۆڵی خۆیان لە خزمەتی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی دەگێڕن، لە زەینیاندا نەبووە خۆیان بخەنە شوێنێکی تایبەت، ئەوان داوای پێشەنگایەتی ناکەن و هەوڵی بۆ نادەن، ئەوان لە دەروونەوە کۆشش دەکەن و نابینرێت ئەوان خۆیان بکەنە خاوەنی ئەو کۆششە، کاتێك ئەرکەکەیان کۆتایی دێت مێژوو لە شوێنێکی دیاری تایبەت دایاندەنێت بێ پێداگرتن و خۆهەڵکێشان!

ئەمە بە ئاشکرا لە گەورە محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) و هاوشێوەکەی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەبینیت، هەروەك لە ژیننامەی سەرکەوتوو سەلاحەددینی ئەیوبی و هزری ((غاندی))* و سادەیی و هێمنیی ((نیلسۆن ماندێلا))**دا دەبینیت.

هەموو ئەوانە بە هزری گشتگیر ئاوێتە بوون، جا هزری یەکسانی بوو بێت یا دادپەروەری یان دژایەتیکردنی ستەم یان بەرزبوونەوە بە

---

* سەرکردەی گیانیی هیندییەکانە، ناوی تەواوی "موهانداس کرمشاند غاندی"ە، لە ١٨٦٩ لەدایکبووە، ڕابەرایەتیی بزواتی سەربەخۆیخوازی و خەباتی ئاشتییانەی هیندییەکانی کردووە، لە ١٩٤٨ کوژراوە. (و)

** سەرکردەی شۆڕش و سەرکۆماری پێشووی ئەفریقیای باشوورە، لە ١٩١٨ لەدایکبووە، ڕۆڵێکی باڵای لە بەرەنگاربوونەوەی هزری ڕەگەزپەرستی لە وڵاتەکەی گێڕاوە و خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی وەرگرتووە، لە ٢٠١٣ کۆچی دوایی کردووە. (و)

بەها گیانییەکان بێت و جێبەجێکردنیان بۆ ڕەفتاری داهێنەرانەی مێژوو، دەتوانیت بە ڕوونی ئەوە ببینیت کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) چوو بۆ بانگکردنی خەڵکی تائیف ئەوان سووکایەتییان پێکرد، کاتێك فریشتەی چیاکان هات بۆ لای مۆڵەتی لێ خواستن دوو چیا پێکدا بدات و ئەو ستەمکارانە لەناو بەرێت، دەبێت وەڵامی پێغەمبەر و ئەوەی بە تەواوی واز لە بەشی دەروونی و مافی دەهێنێت ئەوەیە:

**((بەڵکوو خودا بکات لە پشتی ئەوان کەسێك بێن خودا بپەرستن)).**

هەروەها عومەری کوڕی خەتابیش، ئەوەی ماوەیەك پێش موسڵمانبوونی دژایەتی ئیسلامی دەکرد دەمانبینی پیاوێکی دڵڕەقی توندی بەتوانا بوو، خاوەن شکۆ و هێز بوو، یەك لە موسڵمانەکان هانی دا و سنووری بەزاند بە گوتنی:

**((سوێند بە خودا تا گوێدرێژەکەی خەتاب موسڵمان نەبێت عومەر موسڵمان نابێت!)).**

ئەم پیاوە نەنگی لەوەدا نەبینی لەسەر مینبەر بوەستێت و بڵێت: **((ئەی خەڵکینە، دەبینن من مەڕەکانی خاڵوانم لە هۆزی مەخزووم دەلەوەڕێنم، بەرانبەر بە مشتێك خورما یا مێوژ))**، پاشان لە مینبەر دابەزی، کاتێك هاوەڵەکانی سەرزەنشتیان کرد بە ڕوونی پێی گوتن: **((لە ناخمدا شتێکم دیت ویستم لێی دابەزم))**، ئەمەیە چاودێریی

بەشی دەروون و کوشتنی پێش ئەوەی خۆی دەربخات. ڕەنگە ئەم بۆ هەمان بانگ نەگەڕێندرێتەوە، چونکە موغیرەی کوڕی شوعبە دەیگەڕێنێتەوە بۆ بنچینەی هزرەکە، کاتێك شوعبە پێی گوت: من **باشم خوا نەتهێڵێت.**

عومەر وەڵامی دایەوە: **تۆ باشیت لە خودا ناترسیت، کار کاری عومەر نییە.. کێ بەرانبەر گەورەیی هزرەکە دەبێتە عومەر؟؟**

بهێڵە سنووری کەلەپوورمان بکێشین و تەماشای غاندی بکەین، کە بانگەوازەکەی بۆ ئازادی و لێبووردەیی و دژایەتیکردنی توندوتیژی نەبێت بەرزی نەکردەوە، جێگەی سەرسووڕمانە پیاوێك جگە لە بانگەوازی لێبوردەیی هیچی تری هەڵنەگرتبێت بە کوشتن بمرێت ئەویش دوای شەش هەوڵی شکستخواردووی کوشتن. ئەم پیاوە، بە هۆی بەرگری لە چەوساندنەوەی موسڵمانان لە لایەن هیندۆسەکانەوە لەسەر دەستی پیاوێکی هیندۆسی کوژرا دەڵێت: **((شتێکم نییە بۆ جیهان ئاشکرام کردبێت: چونکە ڕاستی و ناتوندوتیژی لە دێرین زەمانەوە هەبوون))**، ئەم داماڵینە سەرقاڵکەرە کە ڕێگە لە قسە دەگرێت تا ئەوەی ژیانی هەموو شتی تێدایە شایانی ئەوەیە شانازی پێوە بکات، ئەو لە تاکێك زیاتر نییە لە قەوارەی هزرێکی مەزندا.

خۆ داماڵین بۆ هزرەکە لە ناساغییەکانی دەروونی مرۆڤایەتی دەیپارێزێت، ڕوون و باڵای دەکات و توانای ڕفاندنی ژیری و ئاوەزەکانی هەیە، هەروەك خۆداماڵینمان وامان لێ دەکات زیاتر ڕاستگۆ بین لە بانگەشەکردن بۆی، خوامان ناوی شکۆدار بێت بە پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت:

((باش دەزانین گوفتاری ناڕاستی خوانەناسان دڵتەنگت دەکەن، چون ئەوان بە درۆت ناخەنەوە، بەڵکوو ستەمکاران نکووڵی لە ئایەت و بەڵگەکانی خودا دەکەن))

دڵتەنگیی باڵا، دڵتەنگییەك بۆ دوورکردنەوەی نێوانی خەڵکی و ڕاستییە، دڵتەنگییە نەك تووڕەیی، نەك بێزاری، نەك بۆڵەبۆڵکردن، ئەی هاوڕێم ئەم داماڵینە پاڵت پێوە دەنێت دڵخۆش و خۆشحاڵ بیت کاتێك هزرەکە سەر دەکەوێت، دڵتەنگ دەبیت و دەروونت تۆمەتبار دەکەیت کاتێك سەرکەوتن دوا دەکەوێت. هەستە نەرێنییەکانی تر جێگەیان لە دڵی ئەو کەسەدا نییە، کە خۆی داماڵیوە و دڵسۆزە بۆ هزرەکە و پرۆژەکەی.

خۆداماڵین ئەوەیە مرۆڤ خزمەتکاری هزرەکەی بێت، گوێڕایەڵی بێت و خۆی ملکەچ بکات بۆ فەرمانەکانی. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەسفی پیاوێکی کرد بە فەرموودەی:

((خۆشی بۆ بەندەیەك هەوساری ئەسپەكەی لە پێناوی خوا ڕابكێشێت پرچی ئاڵۆسكا بێت و پێیەكانی تۆزاوی بوو بێت، ئەگەر پیاسەوانی هەبێت لە پاسەوانییە، ئەگەر لە دواوە بێت لە دواوەیە، ئەگەر مۆڵەت هەبێت مۆڵەت بە ئەو نەدرێت، ئەگەر شەفاعەت بكرێت شەفاعەت بۆ ئەو نەكرێت)) ((بوخاری گێڕاویەتییەوە))

**دەگەڕێمەوە بۆ لات ئەی هاوڕێی گەورەم و دەڵێم خۆدامالینت لە بەشی دەروونت و ڕازیبوونت بەو ڕۆڵەی داوات لێ دەكرێت، هەرچەندە بە سادەیی دەست پێی بكات. ئەمە ڕێگەی سەركەوتن و جیاوازبوون یەكانگیر دەكات.**

ئەگەر تۆ لە گرووپێكدا بیت یا بە تەنیا كار بكەیت، ئەگەر هزرەكە ئایینی یان كۆمەڵایەتی، یا مرۆڤایەتی بێت، پێویستە خۆت لە ویستەكانی دەروونت دابماڵیت. بە بەهێزی لەنێوان ویستی بەرزخوازی و بۆماوە و خودخۆشەویستی و داوای پێداهەڵدان و لەنێوان پاڵنەكارەكانی خاكیبوون و سۆز و بەرژەوەندیی گشتی بوەستە، ڕێگری لە یەكەمیان بكە و كۆنتڕۆڵیان بگرە و دووەمیان گەشە پێ بدە بە گیانی لێبوردەیی و هێمنیت.

لە گیانی هەمووماندا ویستێك بۆ داواكردنی پێداهەڵدان هەیە، تا لە چاوی خەڵكیدا گەورە بین، هەندێكمان شەرمەزار نابێت لەوەی سوپاس دەكرێت لەسەر ئەوەی نەیكردووە، هاوڕێم هەمووومان بە

ڕووی بای منێتی دەبینەوە و هەستی کینە و ئێرەیی لەنێوانماندا بڵاو دەکاتەوە، ترسی هەموو ترسەکان ئەوەیە ڕێگەی بۆ بکەینەوە و بۆمان نەگیرێتەوە.

قسەم بۆ بکە هاوڕێم لەبارەی ڕۆژێك هزرێکت بنیات بنێیت ببیتە هاوسەر یان باوکێکی باش و جەخت لەوە دەکەمەوە بەمە نموونەیەکی بەختەوەرانەی هاوسەرداری پێشکەشی ژیان دەکەیت، بە تایبەتی لە کۆمەڵێکدا خەریکە پرۆسەی هاوسەرداری دەکەوێتە بەر هەڕەشە و قسەکردن لەبارەی خێزانی سەرکەوتوو شتێکی بێزراوە، ئەمە لە سەرەوەی ئەو حەوانەوەیە، کە لە پێی دڵخۆش دەبێت لە ژیانی تایبەتیدا.

پاش گوتی: بەمە وات لێکردم خۆم لە تێڕوانینی منێتی داماڵم، پڕۆژەی خێزان وای لێ کردم تەماشای هەموان بکەم نەك من، هەردەم خۆم وەك قوربانی نەبینم، وای لێهات زیاتر تێ بگەم و خۆشیانم بوێت، زێتر خەشم و تووڕەیم بخۆمەوە، پتر ئاگام لە دەروونەکانی تر بێت و نزیك بم لە ئازار و شادییەکانیانەوە.

مەگەر پێم نەوتی هاوڕێم.. گەورەیی کارێکی جادوویی نییە و پێویستی بە سازکردنی شتی ئەستەم نییە، گرنگ ئەوەیە ئەوە بکەی، کە پێویستە لەسەرت بیکەیت و ململانێی دەروونت بکەیت

ئەگەر بە قسەی خراپ فریوی دای، خۆت لە ویستەکانی هەوەست داماڵە.

تیشکێ

گەورە هەڵپەی ناوبانگی نییە، بەڵکوو لێی ڕا دەکات، لەبەرئەوەی ژاوەژاوی مەترسییە لەسەر ئارامیی دەروونی و دوورکەوتەیی گیانی و ڕابەرایەتیی ئاوەزی..

خالید محەمەد خالید

## ٧. ئاگاداربە نەبیتە پارێزەرێكی شكستخواردوو

**پرسەكەت پێویستی بە یەكێكە سەری بخات، پێویستی بە پارێزەرێكی زیرەكە، نوێنەرایەتی بكات، توانا هەبێت لایەنەكانی ڕوون بكاتەوە و ئەنجامێكی باشتری لێ بەدەست بهێنێت، هەروەها كەسێك بەرگری لێ بكات و هەر گوفتارێك و ڕەفتار و هەڵمەتێك بكرێتە سەری پووچەڵی بكاتەوە.**

ئەركی بانگەوازەكان لەسەر خاوەنەكانیان ئەوەیە بۆیان ببنە سەرباز، هەردەم لە ئامادەباشیدا بن، چاویان كراوە بێت، هەستەكانیان بە ئاگا بێت، هەمیشە ئامادە بێت بەرگری لە بەهاكانی بكات، بەڵكوو قوربانی لەپێناودا بدات ئەگەر كارەكە پێویستی كرد.

زۆربەی جار كێشەكان لەوەوە دروست دەبن ئێمە تەنیا بە هەبوونی نیازە باشەكان واز دەهێنین و بەرگری لە پرسەكە دەكەین، بێ ئەوەی ڕێگەیەك یان شێوازێكی بەدوایەكداهاتوو لە زەینماندا دیاری بكەین، میسرییەكان لە كەلەپوورییاندا جەخت لەوە دەكەنەوە كە ((**بەدەستهێنانی ڕاستی هونەرە**))، هەرگیز پێویست ناكات ڕاستی لە تەنیشتت بێت تا سەركەوتوو بیت، تۆ پێویستیت بە هۆشیاری و زیرەكی و ئارامی دەروون هەیە و زیاتر لەوەش پێویستت بە پلاندانان و ڕێكخستن و ڕێكوپێكردنی كارەكان هەیە.

بانگەوازەکان تووشی مەینەتی دەبن بە هۆی شوێنکەوتووانییان ئەگەر ئاسۆیەکی تەنگ و ئاوەزێکی دەرمارگیر و زیرەکیی سنووردارییان هەبێت، چونکە تیۆرداڕێژەری بانگەواز ناکرێت لە شوێنکەوتووانی دابڕێت. ئاوەز بە شێوەیەکی گشتی قبووڵ ناکات پڕۆگرام لە جێبەجێکردن جیا بێت، تۆ ئەوە ناکەیت، کە نایڵێیت، ڕەنگە خەڵك کاریگەر بن ئەگەر بتبینن لەبارەی بەخشینەوە دەدوێیت، بەڵام ڕێزت دەگرن کاتێك دەبینن تۆ کۆشش دەکەیت و دەبەخشیت، ئەم ڕەفتارە باشترینە بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆییی بەهانەکەت، ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆکارە بووبێت خودامان ناوی شکۆدار بێت ستایشی بەخشینی ئاشکرای کردووە لە بابەتێکدا لە قورئان ئەویش بە فەرمایشتی:

**ئەگەر بەخشینەکانتان بە ئاشکرا بێت ئەوە شتێکی چاکە**

**سورەتی بەقرە (٢٧١)**

لە سەرەوەی ئەمەش لەم سەردەمەماندا تیۆر سوودێکی زۆری نییە، بە تایبەتی ئەگەر تواناییەکی ڕاگەیاندن نەبێت بۆ ڕاستی بۆ بێدەنگکردنی کەڕەنا زۆر و زلەکانی پووچێتی. ئەمە واتا لە کۆتاییدا ئێمە بەرانبەر هەموو ئەوەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە لە ئاڵنگاری و بەربەست و دژایەتی هیچمان نییە جگە لە ڕێگەیەکی سەرەکیی گرنگ ئەویش ((**جیاکەرەوەی ئاکاری**))یە.

بۆیە ئەو جیاکەرەوەیە زۆر پێویستمان پێیەتی بەرانبەر گومان دروستکردن لە نیازەکان و تواناکان و پاڵنەرەکاندا تا بە توندی لێمان دوور بکەوێتەوە، لە کاتێکدا ئێمە بە بێدەنگی و چەسپاوی کار دەکەین.

خوامان پاك و بێگەردی بۆ ئەو پێغەمبەرەکەی و دوای ئەوە ئێمە ئاگادار دەکاتەوە لە کارێکی گرنگ ئەویش ڕووخۆشی و زارشیرینی و زمانڕەوانی یەکێکە لە وردەکارییەکانی قەناعەت پێکردن و کاریگەری، لە جێگە دانانی وشەی جوان، مشتومڕی بەو جۆرەی جوانترین شێوەیە، خوامان ناوی شکۆدار بێت بۆ دڵنیاکردنەوە دەفەرمووێت:

**ئەگەر تووڕە و قسەڕەق بوویتایە لەگەڵیاندا ئەوە هەموو لە دەورت بڵاویان لێ دەکرد**

**سورەتی ئالی عومران (١٥٩)**

ئایا کارەکە بەو ڕادەیە گرنگە؟؟ بەڵێ

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: **((چەندان خواردن هەن ڕێگر بوونە لەبەردەم خواردنی تر))**، لەسەر بنەمای ئەوە دەڵێم: چەندان کەوتن هەبوون

بانگەوازەکانیان کۆتایی پێ هێناوە، چەندان وشە هەبوون چرای ڕاستی و ڕۆشناییيان کوژاندووەتەوە...

پێش ئەوەی کەسێك ئازار بدەیت بە تامکردنی شتێك پێویستە ئاگاداری بکەیتەوە بەوەی چێژی هەندێك لەوانەی دەروون ئارەزووی دەکات لەناوبەر و کۆتایی پێهێنەرە!

بەر لەوەی یەك بە دوای یەك قسە لە دەمتەوە فڕێ بدەیت، بوەستە و پێداچوونەوە بە پیتەکانیدا بکە پێش ئەوەی لە دەم بچێتە دەرەوە و ڕەت بکرێتەوە و بانگەوازەکەش لەگەڵیدا ڕەت بکاتەوە.

فەیلەسووفی ئەڵمانی فریدریك نیچە* لەوەدا ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی: ((**زۆرینەی ئەوانەی هزرێك ڕەت دەکەنەوە تەنیا بەوەی ئەو تۆنە دەنگەوە کە کاریگەریی دوورکەوتنەوەی پێوەیە**))، ئەمەش لەبەرئەوەی مرۆڤ بوونەوەری سۆزدارین، وشەی جوان و بایەخپێدانی نەرم و نیانی مرۆڤایەتی کاریگەریی بەسەریانەوە دەبێت، گوتەی خۆبەگەورەزانی بەفیز یا سووکایەتی و بێباکی دەستپێشخەر لە قسەکردن یا ڕوخساردا دووریان دەخاتەوە.

ئەوێ ڕۆژێ مامۆستای یەکەمی مرۆڤایەتی محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنێو هاوەڵانی دانیشتبوو لەوکاتەدا پیاوێك بەسەردا

---

* ناوی تەواوی "فریدریك ڤیلهێلم نیچە"یە، لە ١٨٤٤ لەدایکبووە، نزیکەی ٢٥ بەرهەمی هەیە، لە ١٩٠٠ کۆچی کردووە. (و)

هات داوای داوەری دەکرد ((دووچاری شتێك هاتبوو)) لێی تووڕەبوو ((بە توندی قسەی لە ڕووی کرد)) هاوەڵانی پێغەمبەر تێگەیشتن پێویستە بێدەنگی بکەن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموون: ((وازی لێ بهێنن چون خاوەنی ماف قسەی خۆیان هەیە)) ((بوخاری گێڕاویەتییەوە)).

**سوێند بە خودا ئەو پیاوە خاوەنی ماف نەبوو، بۆ ئەو نەبوو خۆی لەسەر دادپەروەرترین مرۆڤ تووڕە بکات، بەڵام ئەوە گەورەییی پێغەمبەر بوو کە پەیامەکەی هەڵگرتووە بە ڕەخساندنی کەشی ئازادیی ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندن و قبولکردنی ڕای ئەوی تر، تەنانەت هەر کەسێك هاتبێت لە سەربازێك بۆ سەرکردەیەك یان لە ڕەشۆکەوە بۆ سەرۆك.. هەر بەمەش بانگەوازەکەی سەرکەوت.**

**پارێزەری شکستخواردوو..** هەموو ئەو کەسانەیە کە ئینتیمای بۆ هزرێکی گەورە یا شکۆدار هەیە و دەمارگیر دەبن یا ئاڵنگاری دەکەن و ڕێگە بە سۆزەکانی دەدات کە دەربکەون و هەڵبچن، زمانی دەرفەت بە پێچەوانەکەی و دژەکەی بدات.

**پارێزەری شکستخواردوو..** ئەو کەسەیە وا گومان دەبات هزرە مەزنەکان خۆیان گوازشت لە خودی خۆی دەکەن و دەرك بەوە ناکات پێویستە لەسەری ڕۆڵی بنەڕەتی بگێڕێت بۆ شیاندنی ئاوەزەکان بۆ قبووڵکردنی هزرەکە هەرچەندە گەورە بێت و

ڕووناککردنەوەی ئەوەی لە دەوروبەریەتی تا جوانی و سەرنجڕاکێشی دەربکەوێت.. هەرچەندە ڕوون و ئاشکراش بێت.

**پارێزەری شکستخواردوو..** ئەو کەسە نییە جلکی فرۆشیار دەکات و بازاڕسازی بۆ هزرەکە دەکات و جوانییەکانی دەردەخات و بەرگەی هەرزەگۆییی ((کڕیاران)) دەگرێت بە زەردەخەنەیەکی هێمن و سووکی لە زەردەخەنەکەیدا نییە، بەمجۆرە ئەگەر کەسێکی تر کاڵاکەی لە خۆی بگرێت، ئەوا بە هێمنی ماڵئاوایی لیٚ دەکات بە هیوای ڕەخساندنی هەلێکی تر لە کاتێکی نزیکدا!

پارێزەری سەرکەوتوو.. ئەو کەسە بە چاکی لە پرسەکەی کۆڵیوەتەوە و سەرچاوەکانی هێزی و ئەو شوێنگەیەی ڕاستی تێدایە دەزانێت، زۆر لەسەرخۆ و هێمنە بەرانبەر تۆمەتە ستەمکارەکان هەڵناچێت، بەڵکوو شیی دەکاتەوە و جیای دەکاتەوە و دەیخاتە ڕوو و واز لە ئاوەزەکان دەهێنێت تا ببینن و بیر بکەنەوە..

## ٨. پەلە مەکە لە چنینەوەی بەروبووم

**((پەلەکردن لە ئەنجام)) نەهامەتیی مرۆڤە، هەوڵی بازدان بەسەر هەنگاوە ئامادەکارییەکان و نەبوونی هۆشیاری سەبارەت بە گرنگیی قۆناغە یەکەمینەکان و هەنگاوە بچووکە سادە سەرەتاییەکان.**

گەورە خاوەنی پەیامێکە پێویستە هۆشیاریی بە کارە لە لوتکەی گرنگیدا بێت و ئەرکیەتی بەرەو ئەو هزرە بچێتە کە باوەڕی پێیەتی و لە هەوڵدان و گیانی پێ ببەخشێت تا گەشە بکات و گەورە ببێت، بەڵام پەیوەندیدار نییە بەوەی بەرەکە بچنێتەوە و یا ئەوە بدورێتەوە کە چاندوویەتی!

گومانی تێدا نییە دەروون کاتێك بەروبوومەکەی بینی دڵشاد دەبێت و بە تێڕوانینی ساتی بردنەوە و سەرکەوتن خۆشحاڵ دەبێت، بەڵام بانگەوازە بەرز و شکۆدارەکان زیاتر پێویستییان بە داماڵین هەیە لەو ساتە و پەلە نەکات لە ئەنجامدان و ململانێی دەروون بکات تا ڕازی بکات بە چێژی کار و بەخشش، بێ ئەوەی پەلەی ئەنجام بێت.

چەند ساڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) تەوافی کەعبەی کرد و بە بت دەورە درا بوو؟

چەند کەس لە دە ساڵی یەکەم باوەڕیان پێکرد؟

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) مرد و سنووری پەیامەکەی بە لای کەمەوە لە ڕووی جوگرافییەوە نیمچە دوورگەی عەرەبی تێنەپەڕاند، بەڵام بە لەسەرخۆیی لە ماوەی سالانی پەیامەکەی ئەوەی چاندی و شوێنکەوتووانی پەروەردەیان کرد، وایان کرد ئەمڕۆ شوێنێك لەسەر ڕووی زەوی نابینین دەنگی بانگی تێدا بەرز نەکرێتەوە و گەواهی ئەوەی تێدا نەدرێت، کە محەمەد نێردراوی خوایە.

خوامان پاکی و بێگەردی بۆ ئەو لە سورەتی ئیسراء دا ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی:

((مرۆڤ هەمیشە بە پەلە و بە هەڵەشەیە))

هەڵەشە لە داواکردنی ڕۆزیدا، هەڵەشە لە داواکردنی سەرکەوتندا، هەڵەشە لە مامەڵەکردن لەگەڵ دونیادا بە هەموو ئەوەی تێیدایە. ئەمە سیفەتێکە لە ڕەفتارماندا، بەڵکوو نەنگییەکی مەترسیدارە پێویستە ڕووبەڕووی ببینەوە و زاڵ بین بەسەریدا، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە هزرە شکۆدارەکان و ئەو بیروباوەڕانەوە هەیە، کە کاری لەسەر دەکەین.

پێویستە خاوەنی پەیامەکە دەرك بەوە بکات، کە ڕێچکەکانی خودای پاك و بێگەرد لە زەویدا ئەوەیە ئاڵوگۆڕ لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان زۆر لەسەرخۆ ڕوو دەدات و گۆڕانکاری لە خەڵکی و

کۆمەڵدا کارێکە بە ئاسانی ناکرێت، ڕەنگە پێویستی بە چەند دەیەیەک هەبێت، لە کاتێکدا تەمەنی هەریەک لە ئێمە کورتە ئەگەر بەراوردی بکەین بە تەمەنی شارستانییەکان، ئەمە وا دەکات هەموو قۆناغەکانی گۆڕانکارییەکە بە چاوی خۆی نەبینێت، ڕەنگە ئاماژەکانی ڕوودانی یان کارتێکەرەکانی یاخود بزاوت یا گۆڕانکاری ببینێت.. لەوانەیە هاوسەردەمی هۆکارەکان ئەنجامەکانیش ببینێت، ڕەنگە ئەنجامەکان ببینێت بی ئەوەی کارلێك لەگەڵ پێشەکییەکاندا بکات..

ئەمە وا دەکات ڕوانینی ئەو کەسە ڕوون نەبێت، کە دەرکی ئەو ڕێچکە گەردوونییە ناکات و هەوڵ دەدات پەلە بکات لە بزاوتی پاڵپێوەنان. دەبێت وەك ئەو چرایە بێت کە ڕووناکی بۆ لایەکانیتی لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجی گەورەتر، تاکە ئامانج گرگرتنی تەواوەتییە پێش گەیشتنە مەبەستی داواکراو.

یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە هۆی ئەشکەنجەدانی زۆر لە لایەن بێباوەڕانی قورەیش هەراسان بووبوو، ئازاری دەچەشت دەیبینی وا هاوەڵانی ئەشکەنجە دەدرێن و دەکوژرێن، بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕۆیشت، داوای لێ کرد بە نزا پەنا بباتە بەر خوا تا سەرکەوتن زووتر بێت، لە فەرموودەیەکدا خەبابی کوڕی ئەرت ڕۆژێك بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) چوو و پێی گوت:

**((ئایا سەرمان دەخەیت ئایا لای خودا نزامان بۆ دەکەیت؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: پیاوێك لە پێش ئێوەدا هەبوو چاڵیان لە زەویدا بۆ هەڵکەند و خستیانە ناویەوە و مشاریان هێنا و لەسەر سەریان دانا و کردیانە دوو کەرتەوە، لە ئایینەکەی پاشگەز نەبووەوە، بە شانەی ئاسن شانەیان کرد، تا گۆشتیان لە ئێسك و دەماری جیا کردەوە، لە ئایینەکەی پاشگەز نەبووە، سوێند بە خوا بەم کارە دەزان تا ئەوەی سوارچاك لە سەنعاوە دەچێت بۆ حەزرەمەوت لە هیچ ناترسێت جگە لە خوا و هێرشی گورگ بۆ سەر مێگەلەکەی.. بەڵام ئێوە پەلە دەکەن)).**

سەیری کۆتاییی ئەو فەرموودە دانسقەیە بکە.. ((بەڵام ئێوە پەلە دەکەن)).

ئەمە شوێنی بەستنەوەی ئەسپەکانە*، پێویستە خاوەنانی پرسە گەورەکان دەرك بەوە بکەن گرەوکردن لەسەر ئەو کاتەی لە بەرژەوەندییانە کارێکی بنەڕەتییە، لەبەرئەوەی خاوەنانی بەرەکانی تر ویستی چنینەوەی بەربووم و دابەشکردنی دەستکەوت و تامکردنی بەرهەمەکان بەسەریاندا زاڵ دەبێت، بەرانبەر بەم هەڵسوکەوتە دەبێت ئارامگری و خۆڕاگری و کۆشش و هەوڵی

* پەندێکی پێشینانی عەرەبە، لای خێڵە عەرەبییەکان بەکاردێت، مەبەست لێی ئارامگری و خۆڕاگرییە. (و)

بەردەوامیمان هەبێت بۆ جێهێشتن و فەرامۆشکردن، ئەوە جیاکەرەوەی مەیدانە.

جەخت لەوە دەکەمەوە هەست بە هاوڕێیەك دەکەم لە مەبەستەکەم گەیشتبێت و من داوای ئارامگری و خۆڕاگری دەکەم کە بانگەوازەکەم بۆ تەنبەڵی نییە، نا هاوڕێکەم، بەڵکوو بە پێچەوانەوە سەرەتا پێویستە بە خۆماندا بچینەوە، بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی ئایا بە شێوەیەکی نموونەیی ڕێگە دەبڕین و بە خێراییەکی گونجاو بە گوێرەی قۆناغەکە، بەڵام پێم خۆشە بە توندی لە ڕێچکەی خودا لە گەردووندا ئاگادارت بکەمەوە ئەویش ئەوەیە بەرپرسیاری ئارامگر سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، بە تایبەتی کاتێك کارەکە پەیوەست دەبێت بە مەبەستێکی بەرزی گەورە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە بۆ دڵنیابوون لێی و چاندنی لە دڵ و ئاوەزی خەڵکیدا.

## ٩. بە قەناعەتتدا بچۆوە

**ئایا دەکرێت ئەو پرسەی ساڵانێك لە تەمەنی خۆمم بۆ تەرخان کردووە و بە درێژایی ساڵان بەرگریم لێ کردووە پرسێکی پاك و بەرز و بێگەرد بێت وەك ئەوەی گومانم بۆ بردووە؟!**

دەزانم زۆر سەختە تێڕوانینی کەسێك بۆ قەناعەتهێنانێکی هزری ڕاست بکەیتەوە، کە بە درێژایی ساڵانێکی زۆر باوەڕی پێ هێناوە، لەبەرئەوەی لەو هەژانە دەترسێت، کە دووچاری دەبێت کاتێك دەبینێت قەوارەیەکی گەورە لە ڕابردوودا بە هێز و توندییەوە بەرگری لێ دەکرد ئێستا وا لەبەر چاوانیدا.. کورت و بچووك دەبێتەوە.

کێ دەڵێت ئەمە هەڵگەڕانەوەیە.. و دەبێتە سەربازێکی هێرشبەر، کە بە درێژاییی شەو پارێزگاریی سەربازگەکەی دەکات، ئەو خۆیەتی کە بوردومانی دەکەن، هەرچی وشە و دەستەواژە و ڕەخنەی بریندارکەری توند هەیە بەسەریدا دادەبارێنن.

قسەی من ((بە قەناعەتتدا بچۆوە))، مەبەست لێی ڕامانە لە هزرەکانتدا دوای ئەوەی لە ئاوەزتدا پێدراوە نوێییەکان بە تێپەڕبوونی کات تازە دەبنەوە، ڕەنگە توانایەکی زیاترت بداتێ لە جیاکردنەوە و بژارکردنی، بە تایبەتی لەوەدا و بە تێپەڕبوونی کات و لەگەڵ دەرماگیریی توندمان بۆ هزرەکانمان تێکڵاویی زۆر دروست

دەکەین لەنێوان بەهاکان و بیروباوەڕمان لە لایەك و لەنێوان کۆمەڵێك کۆششکاری و تیۆردانان و ئەو هزرانەی زیادیان دەکەین بۆ پاڵپشتی ئەم بیروباوەڕە لە لایەکی ترەوە، کۆششکاری تا ئاستی پیرۆزکردن بەرز دەکەینەوە و دەیکەینە بەشێك لە بەها، ئەمە سەرەڕای کۆششکاری دوای ماوەیەك لە کەڵك دەکەوێت.

**لەبەرئەوە ئەو ئامۆژگارییە دەکەم هەر یەك لە ئێمە بە قەناعەتەکان و هزرەکانیاندا بچێتەوە، چونکە ئەم پێداچوونەوەیە تەنانەت ئەگەر هەندێك لە بە گومانبوونی لە باوەڕهێنانیان بە پرۆژەکە بۆ دروست بوو بە هۆکارێکی گرنگ دادەنرێت لە بینینی ئەودیوی کارەکان، لەوانە:**

**یەکەم: باوەڕهێنانی زۆر بە هزرەکە:**

گومانی تێدا نییە کاتێك کەسێك بیر لە هزرێك دەکاتەوە، کە باوەڕی پێیەتی، ئەوا ئاوەزی هان دەدات بۆ بیرکردنەوە لێی و بە وردی تەماشاکردنی باشییەکانی و وەستان بە ڕامانەوە بەرانبەر ئەوەی لەگەڵی ناگونجێت یان لە بیروباوەڕ یاخود ئایدۆلۆژیاکەی ناگات، پشت بە چەسپاندنی لە ناوەوە دەبەستێت، ئەویش لە دەروازەی ئاوەزییەوە نەك سۆز بە تەنیا، ئەمە دەستبەری ئەوە دەکات بە شێوەیەکی تەواوەتی یەکانگیریان دەکات.

ئەوەی ئەمە بە تێگەیشتووییەوە ڕەت دەکاتەوە جیاوازە لەوەی بە دەست پێوە گرتنەوە ڕەتی دەکاتەوە، ئەوەی باوەڕی بە چاوی هەیە جیاوازە لەوەی باوەڕی بە دیتنی هەیە.

**دووەم: نزمکردنەوەی ئاستی دەمارگیری:**

کاتێك تەنیا بە سۆز باوەڕمان بە پرسێك هەیە و بە بیرکردنەوە و ڕامانەوە لێی ناڕوانین، لە بەرگریکردن لێی زۆر دەمارگیر دەبین، دەبێتە هۆی زیان گەیاندن پێی، لە کاتێکدا دەبێت وا سەیری بکەین کە کۆششکارییەکی مرۆڤە و بەوەی بانگەواز یان هزرێکی مرۆییە پاڵمان پێوە بنێت بۆ دەست گرتن پێوەی، بێ پێویستبوون بە گرژی و دەمارگیری لەگەڵ ئەوەی بە پێچەوانەی ئێمە لێی دەڕوانێت، وا دەبینێت نەنگییەکانی لەوە گەورەترە لایەنێك چاوپۆشی لێ بکات، باشییەکانی لەوە کەمترە خەڵکی لێ کۆ بکرێتەوە.

نۆرینەی جار دەرماگیری لە نەزانی و داخستنی زەین و نائامادەیی ڕوانینی ڕەخنەکارانەی سەراپاگیرەوە دێت لەبارەی ئەو کارانەی لە دەوروبەرماندایە و هەروەها مامەڵەکردن لەگەڵ کۆششکاریی مرۆیی بەوپێیەی چەسپاون یارای گفتوگۆ و جێگەی گومان نین.

## سێیەم: پێداچوونەوەکان دووبارە زەینت ڕێك دەخەنەوە:

هەندێك بە داخێکی زۆرەوە لە ئاوەز دەترسن و لەوە دەتۆقن ئاوەز بە هەموو تواناییەوە لە بیرکردنەوە و شیکردنەوە کار بکات، ترسی پاداشتێکی بێتە سەر ئەوانەی لە دوایەوە دێن سوپاسی نەکەن، سەرەڕای ئەوە گەورە ڕاستەقینەکان لە زۆربەی جاران خاوەنی توانای پێداچوونەوەی چەسپاوەکانیان هەیە. ئەوە نەبێت زۆرینەی خەڵکی حەز دەکەن ئەوە هەڵبژێرن و ئەوە پەسەند بکەن، کە لەگەڵ حەوانەی نزیکیاندا دەگونجێت و بەرانبەر هەر ئاڵۆزییەکی هزری و زەینی دەرگەی لەسەر دادەخەن.

لێرەدا هەر چۆنێك بێت دەبێت گوێ لەو پرسیارە بگیرێ!

**ئایا دەکرێت مرۆڤ پێداچوونەوە بە هزرێکی بەرز و شکۆدار بکات؟ ئایا دەچێتە ئاوەزەوە مرۆڤ بپرسێت ئایا داد یان شکۆمەندی یان سەرخستنی ڕاستی شتانێکن شایانی ئەوەن باوەڕمان پێیان هەبێت یان نا؟!**

**وەڵام دەدەمەوە.. بەها بەرزەکان ناکرێت کەس جیاوازی لەسەرییان هەبێت، بەڵام ئەوەی پێویستی بە دووبارە سەرنجدانەوە هەیە پلانی کارە، ئامرازەکانە، کۆششکاریی مرۆییە.**

پێداچوونەوە بە سوودی هزرەکەیە و دەوڵەمەندی دەکات و گیانی دەبوژێنێتەوە..

لە سەرەوەی ئەمەوە لێرەدا سەر لێ تێکدانێکی ترسناک هەیە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە هەواداری بۆچوونێک یان کۆششکارییەکی پیرۆزی بەها و بیروباوەڕەکان دەبین، ڕەتی دەکەینەوە لێی نزیک بینەوە یان ڕەخنەی لێ بگرین یاخود لەسەر مێزی ڕەخنە و جیاوازی داینێین.

پێداچوونەوە سوودمان پێ دەگەیەنێت، هزرەکان و بیروباوەڕەکان و کۆششکارییەکان لە بێژنگ دەدات و هەر یەکەیان لە شوێنی دروستی خۆی دادەنێت.

**ئەمە بڕوام پێ بکە سەرەتا و کۆتاییەکەی لە بەرژەوەندیی پرۆژەکەتە و بەرهەمەکەی زیاد دەکات.**

## ١٠. هەوڵدانەكانت پەرش و بڵاو مەكە

**هەرچەندە بەهێز و چالاك بیت، بەڵام شتێك نییە لە سەرەوەی هێز و چالاكیی بەكۆمەڵی ڕێكخراو بێت، كاری بە كۆمەڵ ئەوەیە لەناو خۆیدا هەوڵدانە تاكییە پەرش و بڵاوەكان كۆ دەكاتەوە.**

كاری بە كۆمەڵ ڕەنگە لە هەندێك كاتدا گوشارمان لەسەر دروست بكات، ناچارمان بكات بە ئەنجامدانی ئەركێكی دیاریكراو و هانمان بدات بۆ پابەندبوون پێیەوە. لەوانەیە شتێك لە گیانی حەزی دەركەوتنمان تێدا بكوژێت، بەڵام ئەگەر ڕاستگۆ بین لە پاڵنەرەكانماندا ڕێگەیەكی كورتتر و زیاتر چالاكترە بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەكانمان.

پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خودای لێ بێت) جەخت لەوە دەكاتەوە، كە ((تۆز و گەردی كۆمەڵ لە بێگەردیی تاك چاكترە))، ئەمە لەبەرئەوەی تۆز و گەرد نامێنێتەوە و لەگەڵ كۆمەڵ كۆتایی پێ دێت لە بەڵێندان و ئامۆژگاری لەنێوان تاكەكانیدا دەرفەتی گەڕانەوەیان بۆ ڕێگەی دروست بۆ دەڕەخسێنێت. ڕەنگە تاك ئەگەر چالاكی وریاش بێت لە كاتێك هەر دەبێت لاوازی و پیسی و كەوتن

بەرۆکی پێ دەگرن. بۆیە پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودەیەکدا، کە ئەلبانی بە فەرموودەیەکی باش (حسن) دایناوە، ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی: ((پێویستە پابەندی کۆمەڵ بیت، چونکە گورگ مەڕی دوورکەوتووەوە دەخوات))، ئەوە ڕێنیشاندانێکی پێغەمبەرانەی قووڵە تا هەوڵدانەکانمان کۆ بکەینەوە و یەکی بخەین و پێکەوە هاوکار و هەماهەنگ بین، تاوەکوو سەرپێچی دەروونمان بکەین لە کەموکوڕیی لاوازی و کەوتن و هەوڵە.

خاوەنانانی پەیامە مەزنەکان هەردەم دەرك بەوە دەکەن پێکانی ئامانج بە شێوەی تاکە کەسی بەدی نایەت، بۆیە پێداویستییەکانی سەرکەوتن داوای کۆمەڵێك پێکهێنەر دەکات لە تاکەکەسێك دەستەبەر نابێت هەرچەندە گەورە و بەهێز بێت. سەیری سێ پەیامە ئیبراهیمییەکە بکە بە ڕوونی دەبینیت هەڵگرانی لە پێغەمبەران سوور بوون لەسەر ئەوەی کۆمەڵێك کەسیان هەبێت لەگەڵیان پەیامەکە هەڵبگرن و یارمەتیدەریان بن لە پێناوی بانگەوازکردن بۆی و بڵاوکردنەوەی.

ئەوە مووسا (سڵاوی خوای لەسەر بێت) داوای لە خوا ناوی شکۆدار بێت دەکرد تا بە هارِوونی برای پشتی قایم بکات بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی یەکلاکەرەوە و گرنگدا لەگەڵ فیرعەون پشتیوانی بێت وەك دەفەرمووێت:

گوتی پەروەردگارا سینەم گوشاد و ئاسوودە بکە ﴿٢٥﴾ کاروبارم ئاسان بکە ﴿٢٦﴾

گرێی زمانی بکەوە ﴿٢٧﴾ تا لە قسەکانم تێ بگەن ﴿٢٨﴾ لە کەسوکارم یارمەتیدەرێکم

بۆ بڕیار بدە ﴿٢٩﴾ هاڕوونی برام ﴿٣٠﴾ پشتمی پێ قایم بکە ﴿٣١﴾ بیکە بە هاوبەشم

لە گەیاندنی پەیامەکەتدا﴿٣٢﴾

ئەوەش عیسا (سلاوی خوای لەسەر بێت) حەوارییەکانی هەڵبژارد و لێیەوە بنەماکانی بانگەوازەکەی و پەیامەکەی و بانگەواز بۆکردنی فێر بوون، بەڵکوو لەوکاتەی هەستی بە دڵتەنگیی کەشی دەوری دەکرد پاڵپشتی دەبوون:

کاتێك عیسا هەستی بە کوفر و بێباوەڕیی ئەوانە دەکرد وتی کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا

حەوارییەکان گوتیان ئێمە پشتیوانانی خواین باوەڕمان بە خوایە و تۆش گەواهی ئەوە بدە

ئێمە موسڵمانین ﴿٢٥﴾ پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە و شوێنکەوتەی

## پێغەمبەرەکەتین لەگەڵ گەواهیدەران تۆمارمان بکە ﴿٢٦﴾

### سورەتی ئالی عیمران

ئەوەش باشترین پێغەمبەر و گەورەترین مرۆڤ، خوای پاك و بێگەرد شوێنکەوتووی وەفاداری دڵۆزی پێ بەخشی و نەوەیەك لە باشترین ئەو نەوانەی بەسەر زەویدا ڕۆیشتوون، سەختییەکانی پەیامیان لەگەڵ ئەودا هەڵگرت.. و دوای ئەویش.

ئەمە ڕێچکەیەکی گەردوونییە ناکرێت پێچەوانەی بوەستینەوە هەرچەندە هەریەك لە ئێمە زیرەك یان بەهێز یان کاریگەریش بین، شاعیر بۆ ئاگادارکردنەوی ڕێچکەیە دەڵێت:

**مێروولە بە پێکەوەییان شارەکەیان بنیاد دەنێن**

**هەنگیش بە هاوکاریی یەکتر شیلە بۆ هەنگوین دەمژن**

کاری بەکۆمەڵ بووەتە پرۆگرامێکی گشتیگر و زانستێکە لە زانستەکانی بەڕێوەبردن لە هەموو زانکۆکانی جیهاندا دەخوێندرێت، لە کەرتی دامەزراوەییی قازانجویست بێت یا لە کەرتی خێرخوازی قازانجنەویست. **ستیڤن کۆڤی** یەکێك لە گەورەترین و گرنگترین زاناکانی بەڕێوەبردن لە جیهاندا جەخت لەوە دەکاتەوە بەدوای کەسە سەرکەوتووەکانی ژیان دەچێت و بۆ ساڵانێکی درێژ لە ژێر هاوێنەی پشکنین و ڕامان دایاندەنێت تا ئەوەی دەرکی بەوە کرد

کۆمەڵێك سیفەت هەیە هەموو گەورەکان و سەرکەوتووەکان تێیدا هاوبەشن، یەکێکیان توانای بەشداریکردنە لەگەڵ جگە لە خۆی لە پێناوی بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی ناوازەی نائاسایی و لە کتێبەکەی بە ناونیشانی ((**حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگ**))دا جەخت لەوە دەکاتەوە هەماهەنگی و هاوکاریی لەگەڵ ئەوانی تردا زیادەیەکی گرنگمان پێ دەبەخشێت ئەویش:

بەرهەمهێنانی ڕوانین و وێناکردنی سێیەم نەك تەنیا ڕای من و ڕای تۆ، نەك تەنیا ئاوەزی من و ئاوەزی تۆ، نەك تەنیا هەوڵدانی من و هەوڵدانی تۆ، لێرەدا بۆچوونی سێیەم هەیە و ئاوەزی سێیەم و هەوڵدانی سێیەم باشترە لە عەقڵ و بۆچوون و هەوڵدانی هەریەك لە ئێمە بە تاکەکەسی. کۆفی جەخت لەوە دەکاتەوە کاتێك هاوکاری یەك دەکەین هاوکێشەی لۆژیکی ١+١ =٢ تێدەپەڕێنین بۆ ١+١ =٣ یان ڕەنگە زیاتریش! بە جەختکردنەوە لەوەی هاوکاریی داهێنانکاریی ناوازە دەتوانێت بەرهەمێکی زیاتر بەرهەم بهێنێت و لە هەمان کاتدا هەڵە و کەوتن کەم دەکاتەوە.

بێگومان لێرەدا هەولاوێردی ئەو ڕێسایەش هەیە، ئەوەی بە کۆتوبەندی کۆمەڵ ناڕەحەت دەبێت و حەوانەی لە تاکێتی دەبینێت، بەتاکەکەسی سوود دەگەیەنێت و بەرهەمی دەبێت، لەناو گرووپدا بەخششەکانی پەرش و کەم دەبنەوە، ڕەنگە وای ببینێت وا بۆی باشترە لەگەڵ هەمووان بە یەك مەودا نێوانی هەبێت بێ ئەوەی

لەسەر هیچ گرووپ و قەوارەیەك هەژمار بکرێت. بەڵام ئەوەی ڕێساکە جەختی لەسەر دەکاتەوە هەولاوێردە و پووچەڵی ناکاتەوە، دەنا بنچینە هاوکاری و یارمەتی و کۆمەڵە.

## ١١. لەگەڵ ڕۆڵێکی دیاریکراودا بگونجێ

خودای پاك و بێگەرد بە تواناگەلی ناچوونیەك و بەهرەگەلی جیاواز دروستی کردووین. زیرەکی و ئاگایی و ڕوانینمان وەك یەك نییە، ئەمەش ئامانج لێی دەوڵەمەندکردنی ژیان و ژیاندنەوەی گیانی هاندانە، کە ئەوە نەبێت چاکسازی لە زەویدا بەرپا ناکرێت و تەواوکاری لەنێوان هاوبەشانی سەر زەوی دێتە کایەوە و هەر یەکەیان کارەکانیان بە باشترین شێوە ئەنجام دەدەن، کە پێویستی بە کەسی تر نەبێت..

خاوەنانی پرسە گەورە شکۆدارەکان پێویستیان بە هۆشیارییە سەبارەت بە ڕۆڵە دیاریکراوەکانیان بۆ خزمەتی گشتیی پرسەکە و لەوەوە ناچنە سەر شتی بێجگە لەوە. ئەگەر ڕۆڵت لە سەرکردایەتیدا نەبوو، پێویستە لەسەرت لە ئەنجامدانی ئەرکەکەت بێ هیچ وەستان و فەرامۆشییەك دوا نەکەویت، بەڵکوو دەبێت دوور بکەویتەوە لە پۆشینی جلکی سەرکردایەتی بە فەرامۆشی و تێکشکاوییەوە بەرەو پرسەکەت. ئەگەر ڕۆڵت نەبوو لە پاسەوانیکردن یان ئاوپێدان یاخود چاودێریکردن... پێویستە لەسەرت سەربازێکی بەئاگای هێرشبەر

بیت بێ تەنبەڵی و گوێپێنەدان و دوورکەوتنەوە لەو ڕۆڵەی بۆت دیاری کراوە.

ئەو کەسەی باوەڕی بە پرسەکەی و بانگەوازەکەی هەیە پێگەی سەرکردایەتی و پێگەی سەربازبوون لای ئەو یەکسانە، مادام بوونی ئەو لە هەر شوێنێکدا بێت بە چاکەی بانگەوازەکەی و هزرەکەی دەشکێتەوە، بە تەواوی خۆی لە حەزی دەرکەوتن و خۆشەویستیی سەرۆکبوون دادەماڵێت و خۆی دوور دەگرێت لەوەی لەسەر لوتکەی قوچەکەکە (الهرم) بێت بە چاوپۆشین لە توانا و بنیاتنەرەکانی.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ستایشی کەسێکی گورجوگۆڵ دەکات، کە ڕازییە بە ڕۆڵەکەی لە پێناوی خزمەتی پرسەکەی بێ ئەوەی گلەیی دەرببڕێت:

**((خۆشی بۆ بەندەیەك هەوساری ئەسپەکەی لە پێناوی خوا ڕابکێشێت پرچی ئاڵۆسکا بێت و پێیەکانی تۆزاوی بووبێت، ئەگەر لە دواوە بێت لە دواوەیە، ئەگەر پاسەوانی هەبێت لە پاسەوانییە)).**

ئەی هاوڕێیانم هەریەك لە ئێمە لە شتێکدا شارەزایە و لە زۆر شتی تردا کۆڵەوارە. دەبێت بە تەواوی دەرککردن و زیرەکییەوە ئاگاداریی ئەو شتە بێت کە تێیدا شارەزایە و گرنگی پێ دەدات و واز لەوە بێنێت کە بە کەڵکی نایەت. هەروەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەڵامی هاوەڵی بەڕێز ئەبوزەڕی غەفاریی دایەوە کاتێك

داوای لێکرد بیکاتە میری یەك لە میرنشینەکانی موسڵمانان، بەڵام لەبەرئەوەی پیاوێکی دڵنەرم بوو و ویستی بە تەنگەوە نەهاتنی دونیای هەبوو ڕەنگە ئەمە لە ئاستی تاکەکەسیدا ئاسایی بێت، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك کەس ئەو ئەرکە بخەنە ئەستۆت ئەگەر جێبەجێی بکەیت لەگەڵ باری تاکەکەسی ناگونجێت بە بەراورد بە باری گشتی، هەروەك لەو فەرموودەیەی موسلم گێڕاویەتییەوە..

**((لە ئەبوزەڕ گێڕدراوەتەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کارێکی پێ ناسپێری؟**

**گوتی: دەستێکی لە شانم دا و پاشان گوتی: ئەی ئەبوزەڕ تۆ لاوازیت، ئەمە بەرپرسیارێتییە، ئەمە سەرشۆڕی و پەشیمانیی ڕۆژی دواییە تەنیا بۆ ئەوە نەبێت بە ڕاستی وەری دەگرێت و ئەوەی لەسەریەتی جێبەجێی بکات)).**

ئەمە سەرەڕای ستایشی پێشووی پێغەمبەر بۆی و جەختکردنەوە لەسەر چاکەی ئەو لە خزمەتی بانگەوازدا. لە فەرموودەیەکدا کە پێشەوا ئەحمەد لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەر دەفەرموێت: **((زەوی بەخۆیەوە نەگرتووە و ئاسمان سێبەری بۆ پیاوێك نەکردووە لە ئەبوزەڕ ڕاستگۆتر)).**

لەبەرئەوە ئەبوزەڕ توورە نەبوو، بەڵکوو دەرکی بەوە کرد ڕۆڵی ئەو لە خزمەتکردنی پرسەکەیەتی، نەك لەسەر کورسیی میرنشینێتی

دابنیشت، بۆیە ڕووی بە لای مەبەستێکی تر وەرچەرخاند و ژیانی لە پەرستن و وازهێنان و بە تەنگەوە نەهاتنی دونیا و بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوا و ئایینەکەی بەسەر برد. خوا پلەی پێشەوا سوفیانی کوڕی عویینە بەرز بکاتەوە، کە هاوکات ستایشی یەکێك لە زاهیدەکانی ئیسلام دەکات و پێچەوانەی دەوەستێتەوە لە هەندێك کاروباری فیقهیدا ئەویش بەو گوتەیەی دەڵێت:

((سۆز و میهرەبانی خودا بۆ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، پیاوێك بوو خواناس بوو، بەڵام لە کاروباری ئاییندا شارەزا نەبوو)).

چ نەنگییەك لەوەدایە بەندەی خوا بیت، زاهیدێك بیت بێ ئەوەی شارەزای ئایین بیت؟ کەس ناتوانیت جڵەوی بەهرەکان بگرێتە تەنیا ئەوانە نەبێت دەگمەنن.

نموویەکی تری زۆر گرنگ ئەوە ڕوون دەکاتەوە گەورەکان گلەیی ناکەن لەوەی لەو شوێنە بێنە خوارەوە کە بانگەوازە گەورەکان و پرسە شکۆدارەکان دایان دەنێت. ئەوە خالیدی کوڕی وەلید کە لە سەکردایەتیکردنی سوپا دوور کەوتەوە، هەرچەندە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو بوو، لەژێر سەرکردایەتیی ئەبوعوبێدە کاری دەکرد بێ تەنبەڵی و ناڕازەیی دەربڕین، ئەوەش باشترین فەرمانڕەوا و پاڵپشت بوو.

عومەری کوڕی خەتاب سەرنجێکی گرنگمان پێ دەبەخشێت کاتێك نێردراوی شەڕی نەهاوەند هات بۆ لای و پێی گوت: ئەی میری باوەڕداران، کەسانێکی زۆر مردن تۆ نایانناسیت، کوڕی خەتاب گریا و گوتی: چ خراپییەکی هەیە من نایانناسم کاتێك کە خوا دەیانناسێت!

بە واتای ئەوەی ئەو سەربازانەی کە کتێبەکانی مێژوو فەرامۆشیان دەکەن ناویان بهێنن و خەڵکی لەبیریان دەکەن، خوا بە باشترین شێوە یادیان ڕادەگرێت و ناوەکانیان دەزانێت و قوربانیدان و ئەوەی بۆ بانگەوازەکەیان پێشکەشیان کردووە تۆمار دەکات.

بۆیە ئەم ئاگادارکردنەوەیە پێویستە هاوڕێی گەورەم ڕۆڵت لە خزمەتکردنی هزرەکانت هەبێت ئەگەر لەسەر پشتی ئەسپ بیت، یان لەسەر ڕاستەوخۆ لەسەر زەوی بیت، یاخود لەسەر دوانگە یان شاشەی تەلەفزیۆن بیت، یان لە پەنهاییدا بیت کە خەڵك لێی بێ ئاگان.

شوێنی خۆت بزانە، پاشان هەر چۆنێك بووە پیاو بە، ئاگادار بە با لەوەی بانگەوازەکە لەوێوە بێت.

## ١٢. بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

**چاوی کەسی گەورە پێویست ناکات بە هاوێنەی سۆز ڕەنگین بکرێت.**

پێویست ناکات ڕێگە بە سۆزەکانی بدرێت بەوەی زاڵ بن لە بنیاتنانی بۆچوون و دیاریکردنی ئاراستە و چارەنووس..

خاوەنی پرسەکە کەسێکە باش دەرك بەوە دەکات هەڵسەنگاندنی کاروبارەکان پێویستە ملکەچی بنەما ئاوەزی و لۆژیکییەکان بێت و چاوی ڕەخنەگرانە یەکێکە لەو ئامرازە گرنگەکانەی کە دەتوانین بە هۆیەوە بۆچوونەکان جیا بکەینەوە و لە بێژنگیان بدەین و هەڵیان بسەنگێنین.

لێرەدا ئەدەبیاتێك هەیە پێویستە پێگەیەکی دیاری لە ئاوەزی خاوەن پەیامەکەدا هەبێت و وا بچێتە پێشەوە نەکەوێتە شوێنی هەڵخلیسکانی سۆز و لایەنگریی کوێرانەوە.

یەکێك لە گرنگییەکانی ئەم ئەدەبیاتە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەیە و بە باشی لەسەر بنەمای شێنەیی وەستاوە پێش دانی حوکم و

لێکۆڵینەوە لە شتێك و هەڵسەنگاندنی بە هۆشیارییەکی تەواوە پێش دەرکردنی بڕیار لەبارەیەوە.

ئەمە جۆرێکە لە گەشبینی و نیازچاکی کە پاڵ بە هەریەك لە ئێمەوە دەنێت هەر کاتێك بێت بۆ پەسەندکردنی ڕاستییەك تەنانەت پێچەوانەی ئەوە بێت باوەڕمان پێیەتی، مادام ئاوەز و لۆژیك و ڕاستی بە لایەوە دەچن و جەختی لێ دەکەنەوە.

ڕاستییەکەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە زاراوەیەکی ڕاگوزەر نییە، بەڵکوو جۆرێکە لە زیرەکییەکی ئاوێتە، کە توێژەرانی بە پێناسەکردنەوە و لێکدانەوەی و گەڕان بە دوای ڕێگەکانی پەرەپێدانی سەرقاڵ کردووە، ئەوەی جەختی لێ دەکەنەوە ئەوەیە کارامەییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە چەقی توانای گەشبینی و ڕێکخستن و جیاکردنەوەیە لەنێوان بۆچوون و ڕاستی. ئەمە لەبەرئەوەی مرۆڤی خاوەن بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە توانایەکی گەورە هەیە لە جیاکردنەوەی ئەوەی کامە بۆچوون پێکان و نەپێکان هەڵدەگرێت و لەنێوان ئەو ڕاستییەی کە ڕاڕایی هەڵناگرێت. کێشەی زۆرینەی خەڵکی لە پەسندکردنی بۆچوونەکان و بەرگریکردنە لێیان وەك ئەوەی ڕاستییە، تەنیا لەبەرئەوەی خاوەنەکەی پێگەیەکی گەورە یان جیاوازی هەیە. بەداخەوە زۆرینەی خەڵکی بۆچوونەکان پات دەکەنەوە وەك ئەوەی ڕاستیگەلێکی جەختلێکراو بن، تەنیا لەبەرئەوەی لە هۆیەکانی

ڕاگەیاندن یان لەسەر زاری ئەوانەی بڕوایان پێیەتی و دەیڕازێننەوە دووپات دەکرێتەوە.

لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان ئاگادار بین و هەڵوەستە بکەین پێش پەسەندکردن و جەختکردنەوە لە زانیارییەك یان هەواڵێك یان هەر شتێك، هەروەها لە گرنگییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەدواداچوونە بۆ ئاستی وردیی زانیارییەکە، زانیارییەکان شیی دەکاتەوە و ئەوەیان کە لە خودی خۆیدا بەشێك لە ڕاستی و بەشێك لە هەڵەی هەڵگرتووە مەترسیدارترینیانە و مەترسیدارترین درۆ درۆی نێوان دوو کەوانەی ڕاستییە و ئەوەی مامۆستایانی بانگەشە ناویان ناوە ((بانگەشەی خۆڵەمێشی))، ئەمە نە شەڕە ڕەش بێت بتوانرێت جیا بکرێتەوە و نە ڕاستییە سپی بێت و بە ڕۆشناییەکەی بدرەوشێتەوە. بەداخەوە زۆرینەی مرۆڤ ئەو فێڵەیان لێ دەکرێت، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر خاوەنی پەیام خاوەن ڕوانینی ڕەخنەگرانە بێت و بوەستێت بۆ جەختکردنەوە لە وردیی گوزارشت و سەرچاوەی زانیاری پێش ئەوەی وەری بگرێت.

گرنگ ئەوەیە بوەستین لە دەرکردنی بڕیار یان دادەوەریکردن لەسەر هەر فەرمانێك کە زانیاریی تەواومان لەبارەیەوە نەبێت، ئەمە دەبێتە هەڵویستێکی دروست و ڕوانینێکی ڕاست.

**زانایان ئەوە ڕوون دەکەنەوە بەهای پێوەرەکان گرنگە پێویستە ڕەچاوی بکەین لە کاتی بەڵگەکاری و وردبوونەوە و چارەسەرکردنی کارەکان، ئەوانیش:**

**١ ڕوونیی دەربڕین یان زانیاری:**

گرنگترین پێوەرە لە پێوەرەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، چونکە دەربڕین ئەگەر ڕوون نەبوو، ئەوا ناتوانین بە شێوەیەکی دروست تێی بگەین و ئەوەی لەسەری ڕێك دەخرێت لەسەر بنەمای ئاراستەکردن یان هزرێك یان قەناعەتێکی هەڵەیە.

لەسەر زمانی کەسایەتیی خاوەن بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە ئەم جۆرە دەربڕینانە زاڵ دەبێت وەك: ((**ئایا دەکرێت زیاتر ڕوونی بکەیتەوە؟ – ئایا لەوەو و ئەوەی گوتم تێدەگەی؟– بە دیاریکراوی مەبەستت کامە؟...**))، لەجیاتی هەڵچوونی یەك لە دوای یەك لەگەڵ ئەوەی دەگوترێت ئەوەی لەخۆی دەگرێت لە ڕاڕایی و تێنەگەیشتن.

**٢ دروستیی دەربڕین یان زانیاری:**

پێویستە دەربڕینەکە دروست و جێگەی متمانە بێت، دوای ئەوەی دەربڕینەکە ڕوون دەکرێتەوە پێویستە بە دوای پاشخانی ڕاستییەکەیدا بگەڕێین و مەودای خۆڕاگری بەرانبەر ڕامان و وردبوونەوە و پرسیارکردن هەبێت.

### ٣ پێکەوەبەستن:

مەبەست لێی مەودای پەیوەندیی نێوان ئەو زانیارییە کە دەگوترێت و ئەو پرسیارە یان ئەو بابەتەی کە قسەی لێوە دەکەین یان گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین، لەبەرئەوەی لە فێڵەکانی یاریپێکەرەکان ئەوەیە هەندێك تۆز بە هەودا دەپرژێنن و سیمای شتەکان دەشوێنێت و دیمەنەکە دەشڵەژێنێت و کێشەی تێگەیشتن و وەڵامدانەوە و ڕوونکردنەوەت بۆ دێتە پێشەوە، لەبەرئەوە لە زیرەکیی تۆیە گفتوگۆکار و هێنەری هەواڵ و زانیارییەکە بگەڕێنیتەوە بۆ بنچینەی پرسیار و بابەتەکە، وردی و دیاریکراوی هەردووکیان گرنگن، تا بۆچوون و قەناعەت ڕوون و قوڵەکان بنیات بنرێن.

### ٤ سەرنجدان لە قوڵاییی ناواخنی بارەکان:

کاتێك بابەتێکی هزری چارەسەر دەکەیت، پێویستە بچیتە قووڵاییەوە و ئەو زەمینەیە ببینێت لەسەر بنیات دەنرێت، زۆرینەی ڕەتکردنەوەمان بۆ قەناعەت و هزرەکان بۆ قووڵنەبوونەوەمانە و تێگەیشتنی لەسەر ئەو بنەمایەیە خاوەنی هزرەکە بۆ پەسندکردن و بەرگریکردن لێی خەڵکی بۆ هان دەدات.

### ٥ فراوانی:

مەبەست لێی ئەوەیە ڕوانینت فراوان بکەیت بۆ بینینی سەرجەم لایەنەکانی بابەتی جێگەی گفتوگۆ، ئەمە لەبەرئەوەی پێشدیتنەکانی پرسەکە بۆ دوورترین شێوەی ئێستا دەتگۆڕێت و هەروەها بینینت بۆ سەرەتاکان تێڕوانینت بۆی دەهێنێتە گۆڕان و ئاراستەی تەماشاکردنت بۆی ڕاست دەکاتەوە.

**٧ لۆژیك:**

ئەمە شوێنی بەستنەوەی ئەسپەکانە، دوای ئەوەی زانیارییەکانمان پوخت کرد و لە وردیی دڵنیا بووین و تەماشای لایەنە جۆراوجۆرەکانیمان کرد و بە قوڵی و ڕامانەوە سەیرمان کرد، دوای ئەوە ڕۆڵی لۆژیك و هۆشیاری دێت کە پشتیان پێ دەبەستین لە داوەریکردنی یەکەم و کۆتاییدا. پێویستە تەماشای گوفتار و هزرەکان بکەین و بەشێوەیەکی زنجیرەیی و لۆژیکی ڕێکیان بخەین، گوزارشت لە مانایەکی ڕوون و گونجاو.

**خاوەنی پرس بیرمەندێکی ڕەخنەگری هزر و قەناعەت و ئایدۆلۆژیا هەبووەکانە، تا لە لۆژیکدا هۆکارێکی دەست دەکەوێت بۆ جەختکردنەوەیان و بەهێزکردنیان. دووبارە جەخت دەکەمەوە من لەبارەی کۆششکارییە مرۆییەکانەوە دەدوێم، تا لە زۆربەی کاتدا سیفەتی پارێزراوی و پیرۆزی وەردەگرێت هەرچەندە هەڵە و خراپەی تێ کەوت بێت.**

بیرمەندی ڕەخنەگر کۆمەڵێك خەسڵەتی هەیە کە جڵەوی بڕیارەکانی و دانایی بەسەر کارەکانەوە هەیە، با سەیرێك بکەین پاشان تەماشای خۆمان بکەین بزانین چەند لەو کەسایەتییەوە نزیکین:

**یەکەم: خۆبەکەمزانینی هزری:**

بیرمەندی ڕەخنەگر باوەڕ بەوە دەهێنێت هەرچەندە شارەزا و زانا بە لایەنێك بەڵام توانای مەعریفی سنووردارە، ڕەنگە بە چەندان شت بێ ئاگا بێت، لەبەرئەوە خۆ بەکەمزانە بەرانبەر ئەوەی دەیخاتە ڕوو، بێ شەرمکردن و خۆبەزلزانین کۆشش بۆ لێکۆڵینەوە و ڕامان و فێربوون دەکات.

بەداخەوە هەندێکمان مشتومڕ و گفتوگۆ دەکەین و ئەوانی تر بە هەڵە تۆمەتبار دەکەین، تەنیا لەبەرئەوەی کەمێك لە بازنەی مەعریفەی یا بڕیارسازییەوە نزیکە، وا گومان دەبات زانایە بەوەی خەڵکی تێیدان و گوێ ناگرێت و نابیستێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی تواناکانی دەستەپاچە ببن لە بڕیاردان یان تێڕوانینی دروست.

**دووەم: خۆڕاگری و ئازایەتیی هزری:**

بە تایبەتی بەرانبەر بیروباوەڕەکانی پێشوو و هزرە قوڵەکان و ئەو قەناعەتانەی بەو جۆرە خەڵکی وا دەبینێت کە بەشێکە لە ڕێچکەی

گەردوونی، تاوەکوو ئازایەتی و چەسپاویمان هەبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر بیروباوەڕێك بێ ترس و دواخستن.

**سێیەم: نیازپاشیی هزری:**

پێویستە ئەو پێوەر و بنەمایانەی لەسەر دژەکەی پەیڕەوی دەکەیت، لەسەر خۆشت پەیڕەوی بکەیت، هەموو کار و کۆششکارییەکی هزری بە یەك تەرازوو بپێویت، جا لای دۆستەوە بێت، یان لای دوژمن.

**چوارەم: بەرزکردنەوەی بەهای ئاوەز:**

لەبەرئەوەی سۆز زۆربەی هەڵوێستەکانی کۆمەڵگە دەبات بەڕێوە، بۆیە ڕۆڵت لێرەدا بەدیار دەکەوێت بەوەی ئاوەزت بکەیتە ئەو پارسەنگەی تەرازوو کە کارەکان بەڕێوە دەبات و دەیانکێشێت و لە شوێنی شایان دایاندەنێت.

نووسەر و بیرمەندی ئەمریکی هارناداك Anita Harnadek لە کتێبەکەی (بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە) هەندێك سیفەتی تری بیرمەندی ڕەخنەگر دەژمێرێت، ئەوانیش:

- **زەینی کراوە بێت بەرەو بەو هزرانەی نوێ و نائاشنان پێی.**

- قسە سەبارەت بە شتێك نەكات هیچ لەبارەوە نازانێت.
- بزانێت چ كاتێك لەبارەی شتێكەوە پێویستی بە زانیاریی زیاترە.
- جیاوازیی نێوان ئەو ئەنجامەی دەبێتە ڕاستەقینە و ئەو ئەنجامەی ڕاستەقینەیە بزانێت.
- بزانێت مرۆڤ هزری جیاوازی سەبارەت بە واتای وشەكان هەیە.
- پێویستە لە هەڵەی باو سەبارەت شیكردنەوەی كاروبارەكان دوور بكەوێتەوە.
- پرسیار لەبارەی شتێكەوە بكات تێی ناگات بێ هیچ شەرمكردن و دوودڵییەك.
- هەوڵ بدات جیاوازی لەنێوان بیركردنەوەی سۆزداری و بیركردنەوەی لۆژیكیدا بكات.

بڕوام پێ بكە هاوڕێم پەیامەكەت ئەوەی لێت دەوێت زیاتر لە پێویست هۆشیار بیت تا چاوەكانت نەنوقێنیت.

هەندێك ئایین و مەزهەب و گرووپ شوێنكەوتووانی خۆیان فێر دەكەن ((چاوت بنوقێنە و شوێنمان بكەوە))، هەرچی ئیسلامە چاو و زەینمان دەكاتەوە، لە قورئانی پیرۆزدا نزیكەی ٦٤٠ ئایەت باسی كاركردنی ئاوەز و ڕامان دەكات، هەردەم خوا سەرزەنشتی بەندەكانی دەكات بەوەی ((ئەوە بۆ بیر ناكەوە)).. ((ئەوە ڕانامێنن))... و نەنگی لە خەڵكی میسڕ دەگرێت بەوەی گوێڕایەڵیی

فێرعەونیان دەکرد و بە ئاوەزسووکی و نەبوونی ڕوانینی ڕەخنەگرانە وەسفیان دەکات وەك ئەوەی دەفەرمووێت:

**گەلەکەی بە سووك دادەنا ئەوانیش گوێڕایەڵیان دەکرد** سورەتی زوخروف (٥٤)

خوا لەسەر سورەتی ئەلزومەڕ سەنای هەندێك لە بەندەکانی دەکات بەوەی:

**ئەوانەی گوێ بۆ قسان دەگرن و بەدوای باشترینیان دەچن، ئەوان خوا هیدایەتی داون و هەر ئەوانیشن خاوەنانی ئاوەز و ژیریین ﴿١٨﴾** سورەتی زوخروف (٥٤)

**بۆ خوا پێم بڵێ چۆن باشترین قسە دەناسیتەوە ئەگەر ئەگەر قسەی خراپ نەناسیت؟**

**چۆن دیاری دەکەیت و بڕیار دەدەیت کامە باشترینە تا بە شوێنیدا بڕۆیت، ئەگەر تۆ خاوەنی پێوەرەکانی ڕەخنە و شیکردنەوە نەبیت؟**

لەبەرئەوە لە جوانکاری دابەزاندنی قورئان لە لایەن خواوە پاك و بێگەردیی بۆ ئەو کۆتاییی ئەو ئایەتە پیرۆزەی بەوە هێناوە بەوەی ئەوان خاوەنانی ئاوەز و ژیریین، خاوەنانی ئاوەزگەلی بەئاگا و زەینگەلی هۆشیار و هزری ئازادی درەوشاوە.

پەسەندی ئایینێك دەكەین ڕۆڵەكانی هان دەدات بۆ كۆششكاری و بەكارخستنی ئاوەز، بۆیان دووپات دەكاتەوە مەڵە كۆتاییی دونیا نییە، بەڵكوو پاداشتی لەسەر وەردەگریت ((واتە كۆششكاری مەڵە))، مەرج ئەوەیە ئاوەزمان باش كار بكات و بیر بكەینەوە و ڕێگە بە زەین بدەین گوزارشت لەو هێزە بكات خوا پێی داوە.

## ١٣. قەناعەت پێهێنانی ئەوانی تر بە هزرەكەت

بازاڕسازیی هزر زۆر لە بازاڕسازیی هەر بەرهەمهێنراوێكی بەردەست سەختترە، چونكە مرۆڤ جیاوازن لەو پاڵنەرانەی هزرەكان بنیات دەنێنن، پۆلێكیان بەرچاومان دەكەون سۆزدارین پێویستیان بە گوتاری نەرمونیانی لێوانلێو لە سۆزی پڕ جۆش هەیە كە قەناعەتهێنەر و كاریگەر بێت، هەندێكی تر پێویستیان بە گوتاری ئاوەزگەراییی قەناعەتهێنەر هەیە. پۆلی سێیەم ویستیان قەناعەتهێنانە بەوەی جەماوەر قەناعەتی پێ دێت یا ئەوەی بە ڕۆشنبیریی دابڕاو ناسراوە، پۆلی چوارەم ویستیان قەناعەتهێنانە تەنیا بەو شتەی بەرژەوەندییەكیان بۆ دەهێنێتە دی و پێویستی بەوەیە چۆن قەناعەتی پێ بهێنرێت لەسەر وەتەری بەرژەوەندییەكی بەدەستهێنراوی گشتی یان تایبەت لێ بدرێت.

هونەری كاریگەری و قەناعەتهێنان لە كۆنی كۆنەوە هەیە، پێشتر پێی گوتراوە ((ڕوونبێژی)) یان ((زمانپاراوی)) ڕێگەیەكە دەتوانین

لێیەوە کاریگەری لەسەر هزر و پاڵنەر و ڕەفتارەکانی ئەوانی تر دابنێین، ئەمڕۆ ئەم لایەنە بووەتە زانست، لەگەڵ ئاڵۆزبوونی ژیان و زۆربوونی ئەو پەیامانەی مرۆڤ دەیانبینێت و ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، لە ئێستا قەناعەتپێهێنانی ئەوانی تر بە پەیامێکی بێ هیی تر کارێکی سەختە، پێویستیی بە کەسانی پیشەمەندە.

ڕاستییەکەی خاوەنی پەیام پێویستە فێری بنەما و هەنگاوە زانستییەکان بێت بۆ گەیاندنی هزرەکەی بە ڕوونی و ئاشکرایی بۆ ئەوانی تر، پێویستی بە فێربوونی ئەو شێوازانە هەیە ڕێگەی چوونە ناو ئاوەز و ویژدانی ئەوانی تر ئاسان دەکەن و شوێنی مەبەست دەپێکن. پێویستە لەسەر خاوەنی پەیام زۆرتر توانای کۆنترۆڵکردنی خۆی هەبێت و خۆی لەسەر پشوودرێژی و ئارامگریی جوان و هێمنیی هاوسانگ ڕابهێنێت و هەوڵ بدات ئەوانی تر بە هزرەکە قەناعەت پێ بهێنێت.

ئەی هاوڕێم مرۆڤ سەبارەت هزرت سێ پۆلی سەرەکین:

**پۆلی پشتیوان، پۆلی دژ، پۆلی فەرامۆشکەر**، زیرەکیت لەوەدایە بزانیت ئەوەی گفتوگۆت لەگەڵ دەکات سەر بە کامە گرووپە، ئەگەر سەر بە پۆلی یەکەم بوو، ئەوا بەخێرایی دەردەکەوێت و تێشووی قسە و قەناعەتپێهێنان بۆ تۆ بەسە، بەڵام ئەگەر لە پۆلی دووەم بێت ڕەنگە چارەی نموونەیی ئەوە بێت تا پێت دەکرێت وای لێ بکەیت

بێلایەن بێت، واتە وای لێ بکەیت لەوەی دژتە بیگوازیتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ بێت یان دژت نەبێت، لە ڕەخنەلێگرتنتەوە بۆ وەستان لە ڕەخنەگرتن.

هەرچی ئامانجی تۆیە لەگەڵ پۆلی سێیەم (بێلایەن) ئەوەیە قەناعەتیان پێ بهێنیت پشتیوان و سەرخەر و باوەڕدار بن بە هزرەکە.

زۆر هەڵە دەکەین کاتێك خۆمان دەدوێین و کۆنگرە و دیدارەکانمان بە شوێنکەوتووان و پشتیوانانمان پڕ دەکەینەوە و بە سەرلەقاندن و ئاماژەی ڕازیبوونیان دڵخۆش دەبین، دەرك بەوە ناکەین ئەوە وەك گڵۆپ دەدرەوشێتەوە و وەك خۆری پڕشنگدار دەگەشێتەوە، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتەوە هزرەکە ڕوون و ئاشکرایە لە ئاوەزی ئەوانەدا.

هەروەها هەڵە دەکەین کاتێك مامەڵە لە دژی هزرەکە دەکەین و ئامانجی یەکەم و کۆتایی و تاکە ئامانجمان ئەوەیە قەناعەتی پێ بهێنین سەرەڕای سەختییەکەی، باری خۆمان قورس دەکەین و ناگەین هیچ سوودێك شایانی باسکردن بێت.

زیرەکی ئەوەیە ئامانجێکی واقیعی دیاری بکەیت لە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسەی دەتەوێت بە هزرەکە قەناعەتی پێ بهێنیت، پێی بکەیت.

پاشان دەست دەکەین بە هەندێك هەنگاوی زانستی تا بە هێزی هزرمان یا ڕەسەنایەتیمان قەناعەتیان پێ بهێنین، هەنگاوەکان لەمانەدا کورت دەبنەوە:

### ١. نیازپاکی:

ئەمە یەکەمین و گرنگترین و مەترسیدارترین ستراتیژییە، بەڵام بەداخەوە کاتێك گفتوگۆ لەگەڵ یەکێك دەکەین بە گفتوگۆکەمان بە ئاراستەی جیاوازیی کەسی دەبەین، ئەوا قەناعەتپێهێنان یان قەناعەتپێنەهێنان دەبێتە باسێکی کەسی، ئەمەش مەترسیدارترین بەربەستە دێتە پێشمان.. ئەی هاوڕێم نیازپاکی هانت دەدات بۆ خۆڕاگری، کە خۆڕاگر نەدەبووی ئەگەر قسەت لەبارەی پرسێکی کەسییەوە بکردایە و هەستت پێ دەکرد و ئەو وشە و گومانانەی ڕووبەڕووت دەکرایەوە دەتخواردەوە و بە جۆرێك لە ڕازیبوونی گیانی وەرت دەگرت، ئەوەش بەهۆی خۆڕاگر دەبیت و ئارام دەگریت لە پێناوی پرسەکەت و ڕازیکردنیان.

زەردەخە دەکات لەو کاتەی لوتی بەرانبەر دەشکێنێت، بە هێمنی دەدوێت و سەرنج دەدات، هەرچەندە دەتوانێت تا ئەوپەڕی دەنگی بەرز بکاتەوە، بە دەنگی بەرز و قسەی هەڵچوو بێزار دەبێت. نیازپاکی تەوەرێکی زۆر گرنگە تاوەکوو زۆرتر هاوسەنگی و هێمنی و هێزت هەبێت.

## ٢. تێگەیشتن لە تێڕوانینی ئەوی تر:

قسەکەری باش گوێگری باشە، قەتهێنانت بە ئەوانی تر داوات لێ دەکات سەرەتا لێیان تێ بگەیت و لەو پاڵنەر و بنەما و بیانووانەی باوەڕی پێەتی، هەروەك گومان و بیانووەکان وا دەکەن هەڵوێستێکی جیاواز لە پرسەکەت وەربگریت.

وازی لێ بێنە قسە بکات و لە سەرەتاوە لەبارەیەوە تێڕوانینێك یان قەناعەتێکی کەسی مەخە ڕوو، هەرچەندە بە گاڵتەجاڕی و خراپی و پێکەنیناوی لە ڕووی ئاوەزی و لۆژیکەوە بنیات نرا بێت، چونکە لەگەڵ لاوازیی بەرانبەر لۆژیکی تۆ پتەو و سەخت دەبێت لە ئاوەزی ئەوی تر، ئەوەی هەروەك پێشتر گوتم لە ڕوانگەی سۆز و بەرژەوەندییەوە یەك دەگرن.

تێگەیشتنت بۆ تێڕوانینی ئەو تەنانەت ئەگەر قبووڵیشی نەکەیت، بە زیرەکی دەتباتە خاڵی سێیەم.

## ٣. وەستان لە ناوچەکانی بەیەکگەیشتن:

کاتێك گوێی لە خەڵکی دەگریت، بە وردی دوو شت دیاری بکە، یەکەم ناوچەکانی جیاوازی و بەرکەوتن، دووەم ناوچەکانی بەیەکەیشتن و خاڵەکانی ڕێککەوتن، ئەوە وات لێ دەکات پاڵپشتت بێت بۆ قەناعەتپێهێنانی بەو جۆرەی دەتەوێت یان تواندنەوەی ئەو

چیا بەستەڵەکەی لەنێوانتاندایە.. توانات بۆ داڕشتنی گوتارەکەت بە داڕشتنێکی ئەرێنییە و ئەو کەسەی گفتۆگۆت لەگەڵ دەکات بەرەو پێشی دەبات و ئاستی پێکدادان و دابڕان زۆر کەم دەکاتەوە. زۆرجار ئەوە فەرامۆش دەکەین لەنێوان خۆمان و دژەکانمان ناوچەگەلی بەیەکگەیشتن و ڕێککەوتن هەیە و وا گومان دەکەین جیاوازیی ئایدۆلۆژیا و قەناعەتەکانمان جیاوازیی لە هەموو وردەکاری و ڕوانینەکانمان بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەمەش ڕاست نییە، بەڵکوو دەکرێت بە هۆی شتێکەوە لە ڕێکخستن و ڕامان لەسەر خاڵگەلی بەیەکگەیشتن هەڵوەستە بکەیت و لەسەری بوەستیت و بە دەست لێی وەربگریت، تا گوێی لەوە بێت، کە دەبێت گوێی لێ بێت.

### ٤. خاڵە بەهێزەکانی خۆی پێ بدە:

جیاوازی وات لێ نەکات پێچەوانەی ئاوەز و لۆژیك و ڕاستی بوەستیتەوە، ئەگەر تێڕوانین یان بەڵگە یاخود خاڵگەلی بەهێزت بۆ ئاخێوەرەکەت نەبوو باشترە دادمەند* بیت و خۆبدەیتە دەست ڕاستی ئەوەی دەیڵێت و ئەو تێڕوانین یاخود شیکارییەی هەیەتی، بەمجۆرە زیاتر وەك دادمەندێکی نیازباش دەردەکەویت، ئەو

---

* دادمەند: المنصف (و)

دەکەوێتە هەڵوێستی شەرمەزارانەوە ئەگەر خۆنەداتە دەستی دروستی هەڵوێست و تێڕوانینی تۆوە.

### ٥. ئەوەی بڵێ لەگەڵ ئاخێوەرەکەت دەگونجێت:

ڕەنگە بەڵگەی زۆری قەناعەتپێهێنەرت هەبێت، پێویستی بەوە نییە هەموویان بڵێیت، ڕەنگە بەخشندە بیت لە خستنە ڕووی هەموو بەڵگەکان و بەرانبەرەکەت جا تاك بێت یان گرووپ لە دەریای گەواهیدەر و ڕاستییەکان نقوم بکەیت و لەوانەیە زیانت لێ بدەن ئەگەر زیاد لە پێویست بوون. تەنیا ئەو گەواهیدەر و بەڵگانەی بۆ بخە ڕوو، کە لەگەڵ ئاوەزی ئاخێوەرەکەت و ئەو هەڵوێستە دەگونجێت، کە تۆ تێیدای.

### ٦. جەختکردنەوە لە سەرچاوەکانت:

کە قسەکەت کۆتایی پێ دەهێنیت هەوڵ بدە تێڕوانینت پوخت بکەیتەوە، جەخت لەوە بکەیتەوە کە دۆزیوتەوە لە نزیکبوونەوەی ڕوانین و هزرەکان، ئاخێوەری بەرانبەر سەرسووڕمان مەکە لە مانای وشەکان و ناواخنی ئەو پەیامانەی دەتەوێت پێی بگەیەنیت. بە

وشەگەلی کورت و ڕوون بۆ گوێگرەکانت ئەوە دووپات بکەوە کە هەوڵت دەدا لە ماوەی قسەکردنت بۆیان ڕوون بکەیتەوە.

ئەم حەفت بنەڕەتە سەرەکییە ڕۆڵێکی گرنگ لە قەناعەتپێهێنانی ئاخێوەری بەرانبەرت دەگێڕن، بەڵام پێش هەموو ئەمانە پێویستە ئاخێوەری بەرانبەر یان جەماوەرەکەت بە باشی بخوێنیتەوە، تا بزانیت ئایا سۆزدارییە یان ئاوەزییە، توندڕەو یان دادمەندە، لەگەڵتە یان دژتە؟

شارەزایانی بازاڕسازی زۆربەی جاران پەنا دەبەنە بەر ((شێوازی دۆڕان)) لە مامەڵەکردن لەگەڵ کڕیارە سۆزدارەکانیان، مەبەستیان لەمە پێدانی ئاماژەیە بە کڕیار بەوەی ئەو کاڵایانە نەکڕن، کە بازاڕسازییان بۆ ناکرێت دەیانخەنە ناو دۆڕانێکەوە زیاترە لەوەی چێژی لێ وەربگرن، ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو بنەڕەتە دەروونییەی دەڵێت: ((هیچ کەسێك لە ئێمە نابێت هیچ شتێك بدۆڕێنێت یان لەدەست بدات))، ڕەنگە دووبارەی بکەمەوە ئەگەر بارەکە پەیوەندیی بە قازانجەوە هەبێت، بەڵام ڕشت دەبم لەسەری کاتێك دۆڕانی شتێکم پێ دەڵێیت یان ئامارێك کە ئەنجام دراوە بەوە جەماوەر ئاگادار دەکرێتەوە بە ئاگا دەبێت و وەڵامی ئەو بانگەشەیە دەداتەوە، کە بە ((دەرفەتی تەمەن لەکیس مەدە)) دەست پێ دەکات زیاترە لەو کارلێککردنەی کە بە بانگەشەی ((دەرفەتی تەمەن بقۆزەوە))!

لەم خاڵەدا دەمویست ئەوە بڵێم بازاڕسازیی سەرکەوتووی هزر پێویستیی بە کارامەیی و زیرەکی و پیشەمەندی هەیە و زۆربەی جار سەرکەوتن لە یاری ئاوەزەکاندا بۆ ئەو کەسەیە کلیلەکانی پێیە.

## ١٤. ئەرێنی بە

خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی ئەرێنی شتێکی بنەڕەتیی خاوەنی پەیامە، بەڵکوو دەکرێت بڵێین خاڵی جیاکەرەوەی نێوان کەسێکی سادە و کەسێکی گەورە لەو نێوانە وەستاوە تا چەند پێوەی پابەند دەبین یان پابەند نابین بە کردار و ڕەفتاری ئەرێنییەکان..

ئەرێنیبوون سیفەتێکە لە ناخی هەریەك لە ئێمەدا لە بچووکییەوە بە ڕێگە باوانی یان قوتابخانەی و ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژیێن دەچێنرێت، لەبەرئەوە دەتوانیت ئەوە بە ڕوونی ببینیت چۆن تەواوی گەلێك چێژ لەو سیفەتە وەردەگرن، لە کاتێکدا نەرێنی سیمای گەلێکی ترە، ئەمەش پێچەوانەی ئەرێنیبوونە.

کارەکە بە سادەیی تایبەتە بە وێنەی زەینی و ئەو سروشتە گشتییەی هەر یەك لە ئێمە بە درێژاییی ساڵانی تەمەنی لەبارەی خۆیەوە هەیەتی و ئەو وشە کردارانەی دەیخاتە ڕوو.

نموونەی منداڵێك وەربگرە لە ماڵ دەچێتە دەرەوە باوەڕی بە ڕاستییەتیی منداڵ لە ئەزموون و هەڵەدا هەیە و وا دەبینێت گەورەترین بایەخ بە منداڵان پێدانی دەرفەتی بەدوایەکداهاتووە لە پێناوی گوزارشتکردن لە خۆی و دۆزینەوەی بەهرەکانی.

لێرەدا منداڵ هیچ نابیستێت جگە لە هاندان و هەڵنانی بەردەوام لەسەر ئەنجامدانی شتی نوێ، بێ شکاندنی کەسایەتیی و بنیاتی دەروونی یان هزری بەهۆی هەر خراپییەکەوە بێت.

بەدڵنیاییەوە بارەکە دەگۆڕێت لەنێوان ئەم منداڵە و یەکێکی تر، کە لەسەر بنەمای ئەوە پەروەردە کرا بێت هەڵە بێ سزا دەرباز نابێت، تەنانەت ئەگەر لە ئەنجامی کۆششکارییەك بوو کە شایانی سوپاس و ستایش بوو، لە ئەوەی گەشە دەکات و ئاراستەیەکی هەژارانەی هەیە لە ئەزموون و بەخشینی پێشنیازە نوێیەکاندا، لە پاشاندا بیرکردنەوە بەشێوەی داهێنەرانەی جیاواز. ئەو وا دەبینێت ڕێگەی سەلامەت ئەو ڕێگەیە پێشتر پێیدا ڕۆیشتوون و بەدوایدا ئەوەندە بەسە هەمیشە لە پەراوێزی ژیاندا بژییێت!

ئەوە تاوانێکی گەورەیە کۆمەڵی پەروەردەکاران بەرانبەر ڕۆڵەکانیان دەیکەن کاتێك سیفەتی نەرێنی و ڕازیبوون بە کەمترین کەم لە ناخی ڕۆڵەکانیان دەچێنن، پاشان دەچن ڕەخنەیان لێ دەگرن و پەنجەی تۆمەتیان بۆ درێژ دەکەن.

**بێگومان لێرەدا پرسیارێك لە زەینتدا دەستپێشخەری دەكات ئەویش:**

وا دابنێ من كوڕی دایبابێك بووم دەركیان بە گرنگیی هاندان و هەڵنانم نەكرد بۆ خوڵقاندن و باشتركردنی سیفەتی ئەرێنی لە مندا، تا وای لێ بێت لەو سیفەت گرنگە هەژار بم و كاریگەریی لەسەر ژیانم دەبێت، ئایا چارەسەرییەك هەیە ئەم كەموكوڕییەی پێی چارە بكرێت؟!

**وەڵامەكەش: بەڵێ كۆمەڵێك هەنگاو و ئامۆژگاری هەیە وەری بگرە تا ئەو سیفەتە گرنگە بهێنیتە دی، با گرنگترینیانت پێ بڵێم:**

- **جیاوازی بكە لەنێوان لاوازیی ویست و لاوازیی توانا:** زۆربەمان ئەگەر ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەك نەبووینەوە و نەمانتوانی زاڵ بین بەسەریدا پەنجەی تۆمەت بۆ هەوڵ و ویستمان درێژ ناكەین، بەڵكوو بەرپرسیاریەتیی ئەمە دەكەوێتە ئەستۆی تواناكانمان و هەبووەكانمان.

بۆ نموونە دەڵێین: ((بەداخەوە بە دەوڵەمەندی لەدایك نەبووم و سامانی پێویستم نییە))، یان : ((كەسێكی نزیكم لە شوێنێكی دیاری دەوڵەتدا نییە وەك ئەم و ئەو))، یاخود ڕەنگە لە بێومێدی و كەمزانین بڵێین: ((ناتوانم))

خۆمان تۆمەتبار دەکەین بەوەی بۆ ئەوە لەدایک نەبووین تا بین بە کەسی گەورە، بۆ ئەوە نەخولقێنراوین پەیامهەلگر بین، خوا هیچ هەبوویەکی جیاوازی پێ نەداوین، نە ئامادەییی بانگخوازێکی ناودار، نە ڕەوانبێژیی ڕامیارێکی ئەزموونداد، نە پلان و ڕێکخستنی سەرکردە و ڕابەرێك.

ئەم بیانووانە زۆربەی کات ناڕاستن و تواناکانمان زۆربەی جار بێ تاوانن و کارەکە پەیوەستە بە ویست و هەوڵ و جەسووربوونمانەوە.

**کەسایەتیی ئەرێنی بە بیانووی نەبوونی توانا خۆ نادات بە دەستەوە، هەردەم ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوە و هەوڵدانی بە ئاگا دەهێنێت ئەگەر بینی حەزی تەنبەڵی و وازهێنانی هەیە.**

هۆی شکستت پێ دەڵێت بەهۆی کەمتەرخەمیت لە ئەنجامدانی داواکراو، بە پینەکردنی هەڵەکان تۆمەتبار دەکرێت.

نائامادەییی ویست گرێدراوی بەڵای زۆربەی کەسە پەشیمانەکانە، کاتێك ویست نائامادە دەبێت تواناکانیش بە ڕۆڵی خۆیان نائامادە دەبن، بۆ خوا پێم بڵێ چۆن توانای پلاندانان و داهێنان و گەورەیی و ڕوانینی ڕاستم بۆ دەدۆزیتەوە بە ویست پڕچەك نابم پاڵم پێوە بنێت بۆ گەڕان لە ناوەوەی خۆم و دەرخستنی بەهرەکانی؟!

- **لە بازنەی هەڵوێستەوە بچۆ بازنەی کاریگەری:** کاتێك هەڵوێستێکی ناخۆش بۆ هەریەکێك لە ئێمە ڕوو دەدات، ڕووبەڕووی یەکێك لەم دوو کەسانە دەبینەوە: یان بەرانبەر هەڵوێستەکە دەوەستین و

دەگرین و دەلاوێنینەوە، یاخود بەخێرایی بەرەو بازنەی کاریگەری دەچین و دەست دەکەین بە گەڕان بە دوای ڕێگەی نموونەیی بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم هەڵوێست و کێشەیەدا.

یان بە شێوەیەکی تر تۆ سەرپشکی ئایا لە ناوە بۆ دەرەوە بیر دەکەیتەوە، یان لە دەرەوە بۆ ناوەوە بیر دەکەیتەوە.

یان کێشە و گرفتەکە بەسەرتدا زاڵ دەبێت و دەست بە پەلهاویشتن بە ناختدا دەکات، یاخود تۆ بەسەر کێشەکەدا زاڵ دەبیت و پەلوپۆی دەکەیت پێش ئەوەی گەورە بێت و وای لێ بێت لە گیانت گەورەتر بێت.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ڕوانینێکی داهێنانکارانەی بۆ ئەم بارە هەیە و دەبینین لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێت: **((مەڵێ من ئەوە و ئەوە دەکەم، بەڵکوو بڵێ قەدەری خوا و ئەوەی ویستی ئەوە دەبێت))**

کاتێك دەکەویتە کێشە یان ڕووداوێکی چاوەڕێنەکراوەوە خێرا ((ئەگەر)) دێت بە خەیاڵتدا ئەمەش بۆ لۆمەکردنی بەردەوام هانت دەدات، کێشە و ڕووداوە چاوەڕێنەکراوەکە تێدەپەڕێنیت و یەکسەر دەست دەکەیت بە خستنە ڕووی چارەسەرییەکان.

- **بەسەر ئارەزووی دەروونتدا زاڵ بە:** گەڕان بە دوای حەوانەوە و خەواڵوویی داواکاریی جەستەیە، زۆرینەمان ئەگەر بەرەنگاریی ئارەزووی دەروونمان لە دەستەوەستانی و تەنبەڵی نەبینەوە ئەوا دوور دەبین لە دەستپێشخەری و ئەرێنیبوون.

هەروەك دەروونەکان تووشی زێدەڕۆیی و تاوان دەبن داوای ئەوە دەکەن کە خوا حەرامی کردووە یان پێچەوانەی نەریت و یاسایە. کەسی ئەرێنی ئەو کەسەیە جڵەوی دەروونی خۆی دەگرێت و دەیپارێزێت لە ئارەزوو و ویستەکان و ناچاری دەکات مل بۆ توندی و سەختییەکان بدات.

زۆربەی ئەوانەی لە شەری ژیاندا دۆڕاون، هۆکاری یەکەمی شکستەکەیان خودییە و بەرانبەر ئارەزوو یان داواکاریی ڕێگەپێنەدراو کەوتوون و لە ڕێگەی گەورەیی و باڵابوون لای داون و خستوونەتیە گێژەنی شکست و کەوتنی بەردەوامەوە.

لە باشیی قسە ئەوەیە جەخت لەوە بکرێتەوە سەرکەوتن بەسەر دەرووندا بە درێژایی ڕێگە نابێت، چونکە مرۆڤین وا دروست کراوین زۆر هەڵە بکەین، بەڵام ڕاستییەکەی گەورە ئەو کەسەیە هەمیشە هەڵوێستەکانی ڕاست دەکاتەوە و سوود لە هەڵەکانی وەردەگرێت و سنووردارکردنی گیانی لە زاڵبوونی ئارەزووەکانی گەورەتر دەبێت.

- **خۆت باش بخوێنەوە:** هەریەك لە ئێمە خاوەنی توانا و کارامەیی و بەهرەیە، هەروەها نەنگی و کێشە و کەموکوڕیشی هەیە. کەسی ئەرێنی ئەو کەسەیە لەسەر خاڵە بەهێزەکانی دەوەستێت و هەوڵ دەدات هەردەم بەهێزیان بکات و لەسەر نەنگییەکانی دەوەستێت و هەوڵ دەدات چاکیان بکات و چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە.

خوێندنەوەی هەریەك لە ئێمە بۆ خۆمان پێویستی پێویستی بە چاوکراوەیی و دانایی هەیە، ئەو دوو سیفەتانە مرۆڤ دەتوانێت بە ڕێگەی خوێندنەوە و دانیشتن لەگەڵ ئەزموونداران خاوەنانی شارەزایی و دانایی و گوێگرتن لەوانی تر ئەوانەی متمانەت بە بۆچوونەکانی هەیە لە ڕەخنەگرتن لێمان و دەربڕینی بۆچوون لەبارەمانەوە.

دەگەڕێمەوە بۆ جەختکردنەوە لەوەی کەسایەتیی ئەرێنی توانای ناسینی خۆی هەیە بە باشی و بینینی خاڵە بەهێزەکان و متمانەتکردن پێیان و چارەسەرکردنی هەڵە و نەنگییەکان بە تەواوی لە کەسایەتیدا.

- **بڕوا بە هەموو ئەوە مەکە لەبارەتەوە دەوترێت:** کەسایەتیی ئەرێنی ڕەخنە قبوڵ دەکات و ئەگەر کەسێك لە هەڵە و نەنگی ئاگاداری کردەوە بە ڕامانەوە تەماشای ناخی خۆی دەکات، بەڵام ئەمە مانای وا نییە نائارامیی ویژدان یان شلەژاوی نییە.

لە میانەی سەرنجدانێکی وردەوە دەبینین زۆربەی کەسە نەرێنییەکان نەرێنییەکەیان لەو بڕواکردنیانە بەوەی لەبارەیانەوە دەوترێت، هەروەها زۆرێك لەوانەی زێدەڕۆیی بە بۆچوونی خۆیانەوە دەکەن لە میانەی پێداهەڵدانی زێدە گەیشتوونەتە ئەو وێنەیە.

کەسی گەورە ماوە ماوە بە دانیشتن لەگەڵ خۆیدا بێزار نابێت، بە تەماشاکردنێکی سەراتاپاگیرانەی پشکێنەرانە تەماشای خۆی

دەكات، تا لەسەر ڕەهەندە ڕاستەقینەییەكانی كەسایەتی بوەستێت، دوور لە ڕوانینی ئەوانی تر بژی.

- **بنەما چەسپاوەكانت بە زیرەكی بەڕێوە ببە:** هەموان ٢٤ سەعاتیان لە ڕۆژێكدا هەیە، هەموومان تەنیا كەمئەندامان نەبێت خاوەنی دوو دەست و دوو چاو و دوو پێ و ئاوەز و هەستین! كەسی گەورە لە ژیاندا پێش دەكەوێت و لە میانەی بەڕێوەبردنی باشی كاتەكانی جیاواز دەبێت و مامەڵەی یەكلاكەرەوە لەگەڵ لێهاتووییە كەسییەكانی دەكات و بە شێوەیەكی باش و دروست بەكاریان دەهێنێت. كەسی نەرێنی ئەو بنەمایانە نابینێت، تەنیا ئەوە دەبینێت پێویستی بە هەژمارێكی بانكی و باوكێكی دەوڵەمەند و كەسانێك هەیە لە ناوەندە دیارەكانی دەوڵەت بن!

كەسی گەورە دەرك بەوە دەكات زیرەكی بە تەنیا پێویست نییە، سامان بە تەنیا پێویست نییە، هەروەها مێژووی گەورەش بە تەنیا پێویست نییە.

ئەو شتەی زۆرترین كاریگەری لە جیاوازبووندا هەیە لەسەر ئاستی گشتی و كەسیدا مەودای زیرەكیمانە لە بەڕێوەبردنی بنەما سەرەكییەكاندا، مەودای توانامانە لە پارێزگاریكردن لە درەوشانەوەی گیان و بوژانەوەی ئاوەز و بەڕێوەبردنی دروستی كات و فێربوونی بەردەوامدا.

بێگومان سەرلێشێواو و لە وەهمدا نغرۆ دەبین ئەگەر گوتمان بارودۆخە باشەكان جیاوازی ناسازێنن، ئەوەی ناكرێت دژی بین ئەوەیە

بارۆدۆخی باش یارمەتیی مرۆڤ دەدات لە دانانی کاریگەری کە دەخوازرا بە شێوەیەکی باشتر بوایە ئەگەر بارودۆخەکە خراپ بوایە، بەڵام بە چاوپۆشین لە هەموو ئەو بارودۆخانەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە کەسی گەورە دەزانێت بەوەی خۆ بەدەست بارودۆخە خراپەکانەوە نادات، بەڵکوو وەربەرهێنانی تێدا دەکات بە سەرکەوتنی بارودۆخە باشەکان یا یارمەتیدەرەکان.

لە هەموو بارێکدا ئەوەی لەسەریەتی هەوڵی بۆ دەدات و تواناکانی بە شێوەیەکی ناوازە بەڕێوە دەبات.

- **لە فەلسەفەی شکست تێ بگە: بە یارمەتیت وەڵامی ئەم پرسیارانەم بدەوە:**

لە ماوەی خوێندنتدا چەند کەسی کۆششکار وانەکانی خوێند و کۆششی کرد و دەرنەچوو؟

چەند کەس لەوانەی دیوتە بە باشی پلانی داناوە و کاری لەسەر کردووە لە پێناوی سەرخستنی پرۆژەکەی تووشی شکستێکی بەئێش بووە؟

چەند لەوانەی بینیوتن بزە دەکەن و خەڵکیان خۆش دەوێت و لەگەڵ هەمووان‌دا خاکین، بەڵام بێزراون و کەس خۆشی ناوێن؟

**پرسیارێکی سەیرە.. ئایا وایە؟!!**

چاوگەی سەمەرەییە قسە لەسەر هاوکێشەیەکی نالۆژیکی بکەیت، لەوە ڕاهاتووین لە ڕووی ڕوانین و تێگەیشتنەوە هەموو کۆششکارێك

بەشی خۆی دەست دەکەوێت، ئەوەی کۆشش بکات و بەرهەمەکەی دەبینیت، لۆژیکی نییە کۆتاییی خوێندن کەوتن بێت و ئەنجامی پلاندانان و کۆششکردن شکستی خێرا. هەروەك کەسی خاوەن ئاکاری جوان و زۆر خاکی ناچێتە ئاوەزەوە هەمووان ڕقیان لێی بێت.

**بەڵام ئەم پرسیارانەم پێ گوتی بۆ پێڕاگەیاندنی شتێکی گرنگ..**

کەسی گەورە باش دەرك بەوە دەکات لە ژیان و یاساکاندا ڕاستیگەلێك هەن، کاتێك لە بەدیهێنانی ئامانجێك سەرکەوتوو نابیت، سەرەتا دەست دەکەین بە پێداچوونەوەی ئەوەی بە لایەکانی هاوکێشەکە دەست پێکردووە، شکست واتە لە کاتی ئامادەکردن یان سازدان هەڵەیەك ڕووی داوە و سەرنەکەوتنیش واتە کەمتەرخی لە منەوە بووە و دوورکەوتنەوەی خەڵك لێم ڕەنگە لە ئەنجامی ڕەفتاری خراپی منەوە بێت بەرانبەریان.

لای خۆیەوە دەست دەکات بە چاککردنی هەڵەکان و ڕاستکردنەوە کێماسییەکان.

**شکستی ڕاستەقینە خۆدانەدەستی بەزین و نەخوێندن و وازهێنان لەو دانایییە خوا بۆی ناردووی تا سوودی لێ وەربگریت.**

گەورە دوای سەرنەکەوتن لە خودی خۆیەوە دەست پێ بکات، بە دوای شتێکی هەڵە دەگەڕێت کە تێی کەوتووە و پاشان چاکی دەکات، ڕەنگە نەنگی لە مندا بێت، یان لەوانەیە لە جگە لە من، بینەری کێماسی و هەڵە دەبێت و لەسەریەتی دەست بکات بە گەڕان بە دوای چارەسەردا.

- **هەردەم ئامادە بە بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی:**

مرۆڤی گەورە بەرپرسیاریەتیی هەڵسوکەوتەکانی هەڵدەگرێت، ئەرێنی بیت یاخود نەرێنی، باش بێت یان خراپ، یان خەڵات وەربگرێت یان دووچاری لێپرسینەوە و سزا بێت، بارەکە لە هەموو کاتێکدا لای کەسی گەورە یەکە، بە تەواوی دان بە بەرپرسیاریەتی و ئەنجامەکان دەنێت، بەڵین دەدات کۆشش بەردەوام بێت یان بۆ چنینەوەی دەستکەوتی زیاتر، یان بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵە و سەرنەکەوتن.

نەرێنییەکان ئەوانەن لە بەرپرسیاریەتیی کارەکانیان ڕا دەکەن و ئەنجامەکەی هەڵناگرن و ڕا دەکەن لەوەی دان بە کەمتەرخەمی و هەڵەکانیان بنێن.

لە کۆتاییدا ئەی هاوڕێم هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی هەنگاوی یەکەمی هەموو سەرکەوتنێکە و دەکرێت هەریەك لە ئێمە لە ژیاندا بەدەستی بهێنین، ئەو کەسەی لە بەرپرسیاریەتی ڕا دەکات ناتوانێت

چارەسەری کێشەکەی یان کێماسییەکەی بکات و لە بنەڕەتدا وا نابینێت لێی بەرپرسە. ڕاکردن و بەهانەهێنانەوە خاسیەتی ڕەهای هەموو هەڵچوونەکانیەتی. هەرچی کەسی ئەرێنییە بەرپرسیاریەتی هەڵدەگرێت و وا کار دەکات وەك ئەوەی دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر هەموو بارەکانی دەوروبەری، لە سەرووی ئەمە خۆی پاداشت دەکات لە کاتی سەرکەوتن و خۆی سزا دەدات لە کاتی سەرنەکەوتن، بە جەخت کردنەوە لەوەی بەرپرسیاری ڕاستەوخۆیە لە کارەکانیدا!

پەیامەکەت پێویستیی بە گیانی ئەرێنیبوون و پەیماندانی بەردەوام بە هەنگاونان هەیە

بێ ڕاڕایی و ترس، سۆز و میهرەبانی بۆ ئەو کەسەی لە ڕۆژێکدا گوتی دەستە

لەرزۆکەکان.. ناتوانن هیچ بنیات بنێنن.

## وەسێت

- خودا پایەرزیی و شکۆمەندیی کاروبارەکانی خۆش دەوێت و ڕقی لە بێ بەهاییی کاروبارەکان دەبێتەوە. فەرموودەیەکی ڕاست و دروستە
- نەزانترین کەس سەبارەت بە چاکە ئەو کەسەیە دەنگ بۆ داواکردنی پاداشتدانەوەی بەرز دەکاتەوە.
- تێڕوانینی تۆ ڕاستەقینە نییە، بەڵکوو ئەگەر ڕاست بوو ڕوویەکە لە ڕووەکانی ڕاستی و لایەنێکە لە لایەنەکانی هەق.
- دانایی خوا بڕیاری لێ داوە تاکە کەسێك هەموو ڕاستی قۆرخ نەکات، سەرەڕای کارامەییی لێزانیمان ناکرێت هەموو کات ئێمە ڕاست بین.

- زرنگ ئەو کەسەیە شتەکان وەك ڕاستەقینەی خۆیان دەبینێت، نەك بەو شێوەیەی حەز دەکات و ئاواتی پێ دەخوازێت و دەیەوێت.
- دەمارگیر کەسێکی لاوازە هزرێکی لاوازی هەڵگرتووە، چونکە هزرە گەورەکان هێزی چەسپاویی دەروونی دەبەخشێتە هەڵگرانی و توانای قبوڵکردنی پێچەوانەکەی هەیە.
- زۆربەی ئەوەی لە جیهاندا هەیە لە ڕاستییە گەورەکان و دۆزینەوە سەرقاڵکەرەکان و کارە شکۆمەندەکان، کەسانی وەك من و تۆ ئەنجامی داون و زۆرجار گوێیان تاساوە بە دەربڕینەکانی وەك ((کێ حسێب بۆ تۆ دەکات))!
- پارێزگاری لە هەوڵدانت بکە، چونکە هەوڵدان دەستپێکی شتەکانە، ئەوەی هەوڵدانی باش بێت و تێیدا ڕاستگۆ بێت ئەوا لەوەو بە دوای کارەکانی باش دەبێت.

## کۆتایی

پێش ئەوەی لە کاروانەکە دابەزین و لە یەك جیا بینەوە پێم باشە جەخت لەسەر شتێکی گرنگ بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە نووسەری ئەم وشانە کۆششکارێکە حەز دەکات پاداشتی دواڕۆژی دەست بکەوێت. ئەوەم نووسیوە باوەڕی دڵنیاییم پێیەتی، بەڵام ناتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم ئەوەی نووسیومە دوورە لە هەڵە و کەموکوڕی، هەروەك ناشتوانم بانگەشەی ئەوەش بکەم ڕەفتارم بەتەواوی هاوشێوەی ئەوەیە گوتوومە و فریودان و یەکانگیربوونی تێدا نییە..

من ئەوەی دەینووسم ئەوەیە سەرەتا خۆم مەبەستمە بینووسم، هەوڵێکە پاڵی پێوە دەنرێت بۆ ڕێگەبڕین بەرەو ڕێگەی ڕاست،

ئەوەی پاڵیان پێوە دەنێت بەدەستهێنانی پاداشتی ئامۆژگارییە و لە زۆر کاتدا هاوڕێکەیان دەبێت تا چاکە نیشای خەڵکی بدات و بۆ ئەوە هانیان بدات و ئەگەر سەرکەوتووش نەبوو بۆ جوڵاندیان بەرەو چاکە.

ئەگەر بمەوێت ڕاستگۆ بم لەگەڵ خۆم دەبوایە هەموو ئەو پیتانەی لە سنگمدا نووسیومن دەستیان پێوە بگرم، دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی ئەوە بە بیر ئەو دەروونە بێنمەوە کە فەرمانی زۆری بە تەنبەڵی و حەوانە پێ کردووم، گڕ و تین بدەمە پەرۆشبوونی تا سەرکەوتوو بێت و بەرەو پێش بچێت.

بەڵام حەز دەکەم لەپێناوی جێهێشتنی جێماوەیەکی* جوان لە دونیادا ئەم وشانە زیرەکت بکات، ڕەنگ بڵاوکەرەوە لە گوێگر بەئاگاتر بێت.

**دووبارەی دەکەمەوە ئەی هاوڕێم من لە هەموو مرۆڤێك زیاتر پێویستم بەم وشانە هەیە، بەڵام خەڵکی بۆ هان دەدەم و لەگەڵیشدا وەسێتم ئەوەیە: ئەگەر لە مەبەستە شکۆدارەکەت نزیك بوویتەوە لە نزای پاداشت و لێخۆشبوون بێ بەشم نەکەیت و دوای ئەوانیش نزای بە کوڵ بۆ ئەوەی هەموومان لە لوتکە پێت بگەین نووسەری وشەکان و خوێنەرەکەی.**

---

* جێماوە: أثر

کەریم شازلی

نووسەر و توێژەر لە بواری زانستە مرۆییەکان و پەرەپێدانی کەسی، زیاتر لە ٢٠ کتێبی لە بواری ژیانی خێزانی و پەروەردەییدا هەیە.

بە شێوەی خووڵی لە کۆمەڵێک ڕۆژنامە و گۆڤاری عەرەبیدا نووسیویەتی و بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی لە میسر و وڵاتانی عەرەبی پێشکەش کردووە.

# گەورە بژی

گەورە ڕاستەقینەکان هەرگیز وا نازانن بە مانەوەیان گەورە دەبن، ئەوان ڕۆڵی دیاریکراوی خۆیان لە خزمەتی پرسە گەورەکانیان دەگێڕن، داوای شکۆ و بەرزی ناکەن، بە دوای ڕووناکیی دەرکەوتن و چەپڵە ڕێزان و هەلهەلە لێدان ناگەڕێن، چاوانیان بە دوای ئامانجەکانی خۆیانەوەیە، بە دوای مەبەستە بەرزەکانەوە، بەرەو ڕوویان هەنگاو دەنێن، بە کۆڵنەدانیان چیرۆکێکی تەواو دەنەخشێنن وەك ئەفسانە نەوەکان نەوە دوای نەوە بیگێڕنەوە..

نەخاسمە وەستان لە کار بۆ داواکردنی پێدا هەڵدان و چەپڵە لێدان بۆ گەورەکان پێویست نییە، خوا پلەی ئەوە بەرز بکاتەوە ئەوەی بە ئاگادارکردنەوەوە گوتی: "نەزانترین کەس بە ڕاستی ئەو کەسەیە داوای پاداشتی لەسەر دەکات" لە سەرەوەی ئەوەش نەزانترین

کەس بە گەورەیی ئەو کەسەیە داوا لە ژیان بکات لە کەسایەتیی بەرز بکاتەوە و بە گەورەییەوە لەبارەیەوە بنووسێت..!.

کەریم شازلی

- نووسەر و توێژەر لە بواری پەیوەندییە مرۆییەکان.
- ٢٣ کتێبی بڵاوکراوەی هەیە، ٢ ملیۆن دانەی لێ فرۆشراوە و بۆ ٥ زمان وەرگێڕدراون.
- زیاتر ٢٥٠ هەزار کەسی لە جیهانی عەرەبیدا ئامادە کردووە و ڕاهێناوە، لەبەرئەوەی لە تێزە کۆمەڵایەتییەکانیدا کاریگەری هەبووە، ئەمەش بووەتە هۆی زۆرتر لە خەمە ڕاستەقینەکانی لاوان نزیك بێت.
- لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ لەدایکبووە و بەکالۆریۆسی لە زانکۆی قاهیرە بەدەست هێناوە.

## پێرست

پێشکەشکردن.......................................٥
گەڕانێك بە دوای گەورەییدا.........................٦
ڕاسپاردە..........................................٧
لە دەستپێکدا.......................................١٠
لە بەراییدا هاوار هەبوو!...........................٢٢
گەورە بژی..........................................٤٣
١. چاو ببڕە ئەستێرەکان.............................٤٤
٢. لەنێوان کەوتنی بەرایی.. و ویستی سووربوون.......٥٣

٣. بخوێنە........................ ٦٢
٤. خۆشەویستی پرسێکی گەورەیە.......... ٧١
٥. سەرەتا باوەڕت بە پرسەکەت هەبێت.......... ٧٧
٦. چاودێریی بەشی دەروونت بکە.................. ٨٦
٧. ئاگاداربە نەبیتە پارێزەرێکی شکستخواردوو.......... ٩٤
٨. پەلە مەکە لە چنینەوەی بەروبووم................. ١٠٠
٩. بە قەناعەتتدا بچۆوە......................... ١٠٥
١٠. هەوڵدانەکانت پەرش و بڵاو مەکە.................. ١١٠
١١. لەگەڵ ڕۆڵێکی دیاریکراودا بگونجێ.................. ١١٥
١٢. بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە........................ ١٢٠
١٣. قەناعەت پێهێنانی ئەوانی تر بە هزرەکەت.......... ١٣٠
١٤. ئەرێنی بە...................................... ١٣٨
وەسێت...................................... ١٥٠
کۆتایی...................................... ١٥٢